سەردەمی گوڵین-٥

حەزرەتی

# عەلی

ڕەزای خوای لێبێت

زەکەریا ئوڵاشلی






# سەردەمی گوڵین
# ٥

# حەزرەتی عەلی
## ڕەزای خوای لێبێت

نووسینی: زەکەریا ئوڵاشلی
وەرگێڕانی: دەستەی وەرگێڕانی دەزگای چاپ و پەخشی کانی عیرفان
چاپی یەکەم: کانوونی یەکەم - ٢٠١٤
لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (٦٨٥)ی ساڵی (٢٠١٤)ی پێدراوە
تیراژ: ٣٠٠٠

شوێنی چاپ
Neşe
Neşe Matbaacılık - İstanbul - TURKEY
+90 212 886 83 30
www.nesematbaacilik.com



دەزگای چاپ و پەخشی کانی عیرفان
www.irfanpublishing.com

گوندی ئینگلیزی خانووی ژمارە ٩ / هەولێر
+964 (0) 750 713 80 00

# ناوەرۆك



# لەلای پێغەمبەرمان

سەرباری گەرمای بەتینی وەرزی هاوین، نەبوونییەکی زۆریش ڕووی کردبووە دانیشتوانی شاری مەککە. خەڵکەکە بە ڕۆژانێکی زۆر سەختدا تێدەپەڕین. ئەبوتاڵیب هەموو ڕۆژێك دەچووە بازاڕ و بەدوای ڕێگایەکدا دەگەڕا بۆ پەیداکردنی بژێوی ژیانی ڕۆژانەی خۆی و خێزانەکەی. بەڵام شتێکی ئەوتۆی دەست نەدەکەوت. لەگەڵ ئەوەشدا شەش منداڵی هەبوو. لەگەڵ گەورە بوونی منداڵەکانیشیدا بژێوی ژیانی تا دەهات سەختتر دەبوو.

پێغەمبەری ئازیزیشمان لەوکاتەدا بەدوای چارەسەرێکدا دەگەڕا تا باری قورسی سەرشانی مامی کەم بکاتەوە. ئەمەش وەك وەفایەك بەرامبەری، چونکە لە منداڵیدا بەخێوی کردبوو. هەربۆیە سەروەرمان هەمیشە سەردانی دەکرد و بەپێی توانا هەوڵیدەدا یارمەتی بدات. ئەوەبوو پاش بیرکردنەوەیەکی زۆر ڕێگاچارەیەکی بەخەیاڵدا هات. بۆ ئەم مەبەستەش ڕۆیشتە لای عەباسی مامی و پێی فەرموو:

- مامە گیان، وەك دەزانی براکەت کە مامی منیشە بە ڕۆژگارێکی زۆر سەختدا تێدەپەڕێت. لەم ڕووەوە چۆن دەتوانین یارمەتی بدەین؟

- ڕاست دەکەیت برازاکەم، بەڵام تۆ بیرت لەهیچ کردووەتەوە؟

- بەڵێ بیرم لێ کردووەتەوە بەڵام... نازانم چۆن دەبێت.

- بیڵێ.. بیڵێ. بێگومان ئەگەر بیرۆکەی تۆ بێت ئەوا بە دڵنیاییەوە باش و جوانە.

- پێم باشە من یەکێك لە منداڵەکانی بەخێو بکەم و ئێوەش یەکێکی تریان.

حەزرەتی عەباس بیرۆکەکەی زۆر بەلاوە جوان بوو. بۆیە وتی:

- دەی با خێرا بڕۆین ئەم هەواڵە خۆشە بە ئەبوتاڵیب خۆی بڵێین.

پێغەمبەری خۆشەویستمان (د.خ) لەگەڵ عەباسی مامیدا بەرەو ماڵی ئەبوتاڵیب بەڕێکەوتن. پاش ئەوەی لە دەرگایان دا و مۆڵەتیان خواست، چوونە ژوورەوە. پێغەمبەر (د.خ) ئامانجی هاتنەکەیانی بۆ مامی ڕوونکردەوە و قایلیان کرد. ئەبوتاڵیبیش لە بەرامبەر داواکاری

برازا بێ باوکەکەی کە ماوەیەکی زۆر بەخێوی کردبوو، تەواو دڵی پڕبوو. بۆیە وتی:

- چۆنتان پێ باشە با وابێت. بەڵام دەمەوێت عەقیل لای خۆم بمێنێتەوە.

پێغەمبەرمان (د.خ) عەلی پێنج ساڵانی برد بۆلای خۆی و عەباسی مامیشی جەعفەری لەگەڵ خۆیدا برد و بە دڵخۆشییەوە لەوێ ڕۆیشتن.

بەمجۆرە حەزرەتی عەلی هەر لە تەمەنی منداڵییەوە پەروەردەی دەستی پێغەمبەری خوا بوو. لەو کات و سەردەمەشدا نەفامی لە لوتکەدا بوو. فرۆشیاران لە دەمی مامەڵەی کڕین و فرۆشتندا درۆیان دەکرد. دزینی ماڵی یەکدیش ببووە دیاردەیەکی قێزەون و بە کۆمەڵگەکەدا تەشەنەی کردبوو. لەلایەکی تریشەوە دەوڵەمەندەکان یارمەتی هەژارەکانیان نەدەدا و بەکەم تەماشایان دەکردن.

لەو کاتەدا پێغەمبەری ئازیزمان زۆر بەمانە دڵگران دەبوو. بۆ چارەسەرکردنی ئەم کێشانەی کە وەك درم سەرتاپای کۆمەڵگەی گرتبووەوە، هەمیشە لە بیرکردنەوەدا بوو. بۆیە بەردەوام چاودێری عەلی ئامۆزای دەکرد و هەوڵیدەدا لەم کێشانە بیپارێزێت و ببێتە خاوەن کەسایەتییەکی بەهێز و تەندروست.

* * *



# باوەڕ دەهێنم

حەزرەتی عەلی تەمەنی گەیشتبووە دە ساڵان و لەماوەی ئەم پێنج ساڵەی تەمەنیدا لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (د.خ) فێری ڕاستگۆیی و بوونە خاوەنی بەڵێن و پاراستنی ئەمانەت و یارمەتیدانی هەژاران و گرنگی دان بە خەڵکی و چەندین ئاکاری بەرز و جوان بوو.

حەزرەتی عەلی چاوی ڕەش بوو. باڵاشی لەچاو هاوڕێکانیدا مامناوەندی بوو. ڕەنگی پێستیشی ئەسمەر بوو.

ئەوەبوو ئێوارەیەکیان کە لە ژوورەوە دانیشتبوو، هەر بیری لەو گۆڕانکارییانە دەکردەوە کە لەو ماوەیەدا بەسەر پێغەمبەری خوادا

هاتبوون. بۆیە بە دوای کاتێکی گونجاودا دەگەڕا تا بچێتە لای و پرسیاری هەموو ئەو شتە نامۆیانەی لێبکات کە لەو ماوەیەدا بینیبوونی. چونکە چەند ڕۆژێك بوو کەمتر چاوی پێی دەکەوت. ئیتر بەمەبەستی وەرگرتنی وەڵامێك بۆ پرسیارەکانی بە دەرفەتی زانی و چووە بەردەم ژوورەکەی پێغەمبەری خودا (د.خ).

پاش ئەوەی لەدەرگای دا و هیچ وەڵام نەبوو، جارێکی تریش لە دەرگای دایەوە. بەڵام دیسان وەڵام نەبوو. بۆیە ئەمجارەیان بە پەرۆشەوە سوچێکی دەرگاکەی کردەوە، کەچی بینی وا پێغەمبەری خوا و حەزرەتی خەدیجە دەنوشتێنەوە و بەرزدەبنەوە. بۆیە پەرۆشیەکەی هێندەی تر زیادی کرد و ڕۆیشتە ژوورەوە. چوو لە سوچێکەدا وەستا و بۆخۆی تەماشای شێوازی جووڵەکانی ئەوانی دەکرد. هەر کە لێبوونەوە یەکسەر پرسیاری ئەو جووڵانەی لێکردن. پێغەمبەری نازداریشمان لە وەڵامدا فەرمووی:

- نوێژمان دەکرد.

- نوێژ چییە؟

- پەرستشێکە بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندی ئەو خوایە ئەنجام دەدرێت کە بەدیهێنەری ئێمە و هەموو جیهانییانە.

- باشە کێ ئێمەی دروستکردووە؟

- خوای گەورە و تاك و تەنها. ئەو هیچ هاوەڵ و هاوتایەکی نییە. هەموو ئەو شتانەی دەیخۆین و دەیخۆینەوە ئەو پێی بەخشیوین. ئەو دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە.

- ماناى وايە ئەو ئێمەى دروست كردووە؟

- بەڵێ من و تۆ و هەموو ئەو شتانەى كە هەيە ئەو دروستى كردووە.

- ئەگەر باوەڕ بەو بهێنم چى دەبێت؟

- ئەوا ئەويش تۆى خۆش دەوێت و دەتخاتە بەهەشتەكەيەوە. ئێستا پێم بڵێ بزانم باوەڕ دەهێنيت بەخواى تاك و تەنها؟

- باوەڕت پێدەكەم چونكە تاكو ئێستا درۆم لە تۆ نەبيستووە. بەڵام ئەگەر مۆڵەتم بدەيت دەمەوێت لەگەڵ باوكيشم قسە بكەم.

ئەو شتانەى كە پێغەمبەرى خوا بۆ عەلى باسدەكرد، شتانێك بوون كە يەكەمجارى بوو بيانبيستێت، بۆيە دەمودەست قايل نەبوو. پاشان پێغەمبەرى خوا فەرمووى:

- ئەگەر باوەڕت بەو شتانە هێنا كە بۆم باسكرديت ئەوا دەتوانيت بێيتە سەر ئايينى ئيسلام. ئەگەر باوەڕيشت نەهێنا ئەوا ئەوەى بينيت و ئەوەى بۆشم باسكرديت لاى كەس باسى مەكە.

- بەسەرچاو لاى كەس باسى ناكەم.

حەزرەتى عەلى ئەو شەوە هەر بيرى لە ئامۆژگارييەكانى پێغەمبەرى خوا دەكردەوە. ئيتر ئەوەبوو بۆ ڕۆژى دواتر بە دڵخۆشييەوە هات بۆلاى پێغەمبەرى نازدارمان و وتى:

- باوەڕ دەهێنم بەو خودايەى كە دوێنێ بۆت باسكردم.

پێغەمبەرى خوداش (د.خ) فەرمووى:

- قسەت لەگەڵ باوکت کرد؟

حەزرەتی عەلی بە چەند وشەیەك وەڵامی دایەوە کە زۆر لە تەمەنی خۆی گەورەتربوون:

- ئایا خوای گەورە کاتێك منی دروستکردووە پرسی بە باوکم کردووە، تا ئێستا بۆ باوەڕهێنان بەو من بچم پرس بە باوکم بکەم؟!

- کەوایە ئەوەی من دەیڵێم تۆش دووبارەی بکەرەوە. "شایەتی دەدەم کە هیچ پەرستراوێك نییە جگە لە خوای گەورە. وە شایەتی دەدەم کە محەممەد بەندە و نێردراوی ئەوە."

پێغەمبەری خوا (د.خ) وشەی شەهادەتی هێنا و عەلیش لە دوایەوە دووبارەی کردەوە. بەمجۆرە حەزرەتی عەلی سێیەم کەس بوو کە موسوڵمان بوو لەپاش حەزرەتی خەدیجە و حەزرەتی ئەبوبەکر.

* * *

# لەسەر ڕێگاکەت بەردەوام بە

ئەبو تاڵیب حەزرەتی محەممەدی برازای زۆر خۆش دەویست. جا لە چەند کەسێکیشی بیستبوو کەوا جار جار دەچێتە ئەشکەوتی حیرا و لەوێ دەمێنێتەوە. بەڵام ئاگادار نەبوو لەوەی کە عەلی کوڕیشی موسوڵمان بووە.

بۆیە جار جارە لەگەڵ فاتیمەی خێزانیدا دەربارەی ئەو بابەتە دەدوان و باسی ئەوەیان دەکرد کە چەندە خەمی پێغەمبەری خوایانە (د.خ). هەرچەندە دڵنیابوو لەوەی کە برازاکەی هەرگیز کاری خراپ و هەڵەشە ناکات. بەڵام دیسان بەهۆی ئەو شتانەی دەربارەی ئەو دەیبیست، دەترسا شتێکی خراپی بەسەر بێت.

ئیتر ئەوەبوو ڕۆژێکیان فاتیمەی دایکی حەزرەتی عەلی کە لە میوانی دەگەڕایەوە، لە ڕێگادا چاوی کەوت بە پێغەمبەری خوا و عەلی کوڕی کە بەرەو دەرەوەی مەککە دەڕۆیشتن. کە هاتەوە بۆ ماڵەوە خێرا ڕووداوەکەی بۆ ئەبوتاڵیبی مێردی گێڕایەوە و پێی وت:

- هەرچییەکت کردووە، بزانە ئەوانە بۆ کوێ ڕۆیشتوون!



- خەمت نەبێ خانم. خۆت دەزانی تا ئێستا برازاکەم کارێکی خراپی نەکردووە.

- دەزانم بەس هەر خەممە، عەلیشی لەگەڵدایە. ئەو جارێ منداڵە. ئەی ئەگەر شتێکی بەسەر هات؟!

ئیتر ڕۆژی دواتر ئەبوتاڵیب کەوتە دوای عەلی کوڕی بۆ ئەوەی بزانێت خەریکی چییە و بۆکوێ دەچێت. لە کۆتاییدا عەلی گەیشتە دۆڵێکی دەرەوەی مەککە. پێغەمبەری خواش لەوێ بوو. ئەبوتاڵیب لەبەر خۆیەوە دەیوت تۆبڵێی ئەمانە لێرە خەریکی چیبن؟!

ئەبوتاڵیب هیچ لەو جوڵانە تێنەگەیشت کە برازاکەی و عەلی کوڕی دەیانکردن. چونکە تا ئەوکاتە چاوی بەو جۆرە هەستانەوە و

نوشتانەوانە نەکەوتبوو. هەربۆیە ئەم شتانە بوونە جێی پرسیار لەلای و بڕیاریدا پرسیار لە پێغەمبەری خوا بکات.

ئیتر لەو شوێنەی کە خۆی تێدا حەشاردابوو هەستایەوە. لەو کاتەشدا حەزرەتی عەلی و پێغەمبەری خوا (د.خ) نوێژەکەیان تەواوکردبوو. بەڵام کاتێك حەزرەتی عەلی بینی وا باوکی بەرەو ڕوویان دێت زۆر شڵەژا. بۆیە ئەبوتاڵیب وتی:

- کوڕی خۆم پێویست بە ترس ناکات. هیچ مەبەستێکی خراپم نییە. تەنها دەمەوێت بزانم چی دەکەن.

پێغەمبەری خواش (د.خ) هەستایە سەر پێ و فەرمووی لە مامی خۆشەویستی کرد و پێی وت:

- فەرموو مامە گیان من گوێت لێدەگرم.

- دەتوانم بپرسم کە کەمێك بەر لە ئێستا ئەو هەستانەوە و نوشتانەوەیەتان چی بوو؟

- نوێژمان بۆ خوای گەورە دەکرد.

- ئەوە باسی ئایینە نوێیەکە دەکەیت؟

- بەڵێ مامە گیان ئەوە ئایینی خوای گەورە و فریشتە و سەرجەمی پێغەمبەرانە. ئایینی باپیرە گەورەمان ئیبراهیمە. خوای گەورە فەرمانی پێکردووم ئەم ئایینە بە ناو خەڵکیدا بڵاو بکەمەوە. وەرە تۆش باوەڕ بە یەکتایی خوای گەورە بهێنە و وەرە سەر ئەم ئایینە.

- ئەی ئەگەر پێشینانمان لێیان پرسین ئایا ئێمە ئایینەکەمان بەم

جۆرە دایە دەستتان؟!

- باو و باپیرانمان لەسەر ڕێبازێکی هەڵە بوون. مامە گیان ئایا دەکرێت بتێك کە بە دەستی خۆمان دروستمان کردبێت بیکەین بە خوای خۆمان؟! وەرە، تکات لێدەکەم، تۆش وەرە سەر ئایینی خوای گەورە.

- نەخێر برازاکەم. من هەرگیز لە ئایینی باو و باپیرانمان پاشگەز نابمەوە. بەڵام تا ئەو کاتەی لە ژیاندا بم ئەوا پشتت دەگرم و دەستبەردارت نابم و دەتپارێزم.

دواتر ڕووی کردە عەلی و پرسی:

- ئایا تۆش چویتەتە سەر ئایینی ئامۆزاکەت؟

- بەڵێ بابە گیان باوەڕم هێناوە بە یەکتایی خودای گەورە و بەوەی کە محەممەدی کوڕە مامیشم نێردراوی ئەوە.

- کوڕی خۆم دڵنیابە محەممەد بەرەو خێر و چاکە بانگ دەکات. بۆیە لەسەر ڕێگاکەت بەردەوام بە.

پاشان ماڵئاوایی لێکردن و گەڕایەوە بۆ ماڵەوە. فاتیمەی خێزانیشی بە دڵەڕاوکێوە چاوەڕێی دەکرد. بۆیە هەر ئەوەندەی ئەبوتاڵیب پێی نایە ژوورەوە یەك لەدوای یەك دەستی کرد بە پرسیارکردن.

- چی بوو؟ توانیت بیانبینیت؟ زانیت چی دەکەن؟ هیچ شتێکی ترسناك لە ئارادا هەیە؟

- بوەستە خانم بوەستە با هەناسەیەك بدەم.

- هەواڵی کوڕەکەمم بدەرێ. چی لێ بەسەر هاتووە؟

ئەبوتالیب وتی:

- وابزانم ناهێڵیت دابنیشم. هیچ خەمی کوڕەکەت نەبێت زۆر باشە. لەگەڵ محەممەددایە، هەروەك پێشتریش باسمانکرد برازاکەم بانگهێشتی خەڵکی دەکات بۆ باوەڕهێنان بە خوای تاك و تەنها. عەلیش لەگەڵ ئەودایە. هیچ شتێك لە ئارادا نییە مایەی ترس بێت.

فاتیمە پرسیارێکی تری کرد و وتی:

- باشە ئەبوتالیب، تۆ ڕات چییە لەم بارەیەوە؟

- بە بڕوای من، ئەو شتێکی خراپ ناکات.

- مەبەستت ئەوەیە کە تۆش باوەڕت بە قسەکانی کردووە؟

- هەموو ئەو شتانەم لا پەسەندە کە محەممەد دەیانڵێت. بەڵام باوەڕناهێنم. نامەوێت خەڵکی پێم بڵێن کوڕەکەی عەبدولموتەڵیب وازی لە ئایینی باو و باپیرانی هێناوە.

فاتیمەش وتی:

- منیش هەروەك تۆ بیر دەکەمەوە. پاشان ڕۆیشتە باخچەکە بۆ ئەوەی کارەکانی ڕۆژانەی ماڵ تەواو بکات.

* * *

# کۆچ

ڕۆژ بەڕۆژ ژمارەی ئەو کەسانەی دەهاتنە ناو ئایینی پیرۆزی ئیسلامەوە ڕوویان لە زیادبوون بوو. بۆیە بێباوەڕانیش هەموو جۆرە ئەشکەنجەیەکی جەستەیی و دەروونی موسوڵمانانیان دەدا بۆ ئەوەی لە ئایینەکەیان پاشگەزیان بکەنەوە. ئەم ستەم و زۆرکارییەی بێباوەڕان ئەوەندە تاوی سەندبوو، موسوڵمانان بەجارێ ژیانیان لێ تاڵ ببوو. هەر بۆیە ئیمانداران چوونە خزمەتی پێغەمبەری خوا و داوای مۆڵەتی کۆچیان لێکرد. ئەوەش بۆ ئەوەی بڕۆن بۆ شوێنێکی تر و بتوانن باشتر ئایینەکەیان پەیڕەو بکەن. دوای ئەوە خوای گەورە مۆڵەتی کۆچکردنی بە موسوڵمانان دا.

ئیتر موسوڵمانان ماڵ و سامانیان جێ هێشت و دەستە دەستە بەرەو مەدینە کۆچیان کرد، کە ئەو کاتە پێی دەوترا یەسریب.

کۆچی موسوڵمانان بەرەو مەدینە بێباوەڕەکانی تەواو تووڕە کردبوو. چونکە وا بیریان دەکردەوە کە موسوڵمانەکان لەوێ خۆیان بەهێز دەکەن و دواتر دێنەوە تۆڵەی خۆیانیان لێدەکەنەوە. ئیتر بۆ تاووتوێکردنی ئەم بارودۆخەی کە بەدڵی ئەمان نەبوو، خێرا کۆبوونەوە و یەکێك لە ناویاندا وتی:

- ئایا بیستوتانە کە خەڵکی مەدینە زۆر چاك لەگەڵ موسوڵمانە کۆچبەرەکاندا دەجوڵێنەوە؟

یەکێك وەڵامی دایەوە و وتی:

- بەڵێ بیستوومانە، بێگومان بەم کۆچکردنەیان بۆ مەدینە ژمارەشیان زیاد دەکات.

ئەندامێکی تری کۆبوونەوەکەش هاتە قسە و وتی:

- دەڵێن محەممەدیش بەنیازی کۆچکردنە بەرەو مەدینە. ئەم هەواڵە گەلێك مەترسیدارە. ئەگەر بێت و بتوانێت بگاتە مەدینە، ئەوا چیدی ناتوانین بەرەنگاریان ببینەوە. بۆیە هەرچۆنێك بووە، نابێت بهێڵین لە مەککە بچێتەدەرەوە.

- باشە چۆن دەتوانین ئەمە بکەین؟

ئەبوجەهل لە شوێنی خۆی هەستایە سەرپێ. ئیتر هەموویان بەجارێ ئاوڕیان بەلای ئەودا دایەوە و چاوەڕێی قسەکانی ئەو بوون. بۆیە ئەویش تەماشایەکی کردن و کەوتە قسەکردن:

- جا ئەوە چییە. هەر زۆر ئاسانە، دەیکوژین. ئیتر بەمجۆرە ڕزگارمان دەبێت لەدەستی.

- ئایا خزمەکانی محەممەد لە خوێنەکەی خۆش دەبن؟

ئەبوجەهل زەردەخەنەیەکی کرد و وتی:

- بێگومان هەوڵی تۆڵە سەندنەوە دەدەن. بەڵام ڕێگەچارەی ئەوەشم دۆزیوەتەوە.

- چۆن ڕێگەچارەیەك؟

ئەبوجەهل شەیتان ئاسا کەوتە شیکردنەوەی پلانەکەیی و وتی:

- لە هەر هۆزە و ئازاترین و باشترین جەنگاوەر هەڵدەبژێرین. پاشان ئابلۆقەی ماڵی محەممەد دەدەن و هەر کە هاتەدەرەوە یەکسەر پەلاماری دەدەن و دەیکوژن. بەمجۆرە خوێنەکەی ون دەبێت و کەس بکوژەکە نادۆزرێتەوە.

یەکێك لە ئامادەبووان بە چەپڵە ڕێزانەوە هاواری کرد و وتی: بەڕاستی بیرۆکەیەکی ژیرانەیە. ئیتر ئەوانی تریش بیرۆکەیەیان پەسەندکرد و دەستبەجێ کەوتنە ئامادەباشی بۆ جێبەجێکردنی پلانەکەیان.

بێباوەڕان وایان دەزانی کە پلانەکەیان زۆر تەواوە و هیچ کۆسپ و تەگەرەیەکی نایەتە پێش. هەر بۆیە زۆر متمانەیان بەخۆیان بوو.

خوای گەورەش کە ئاگاداری هەموو جۆرە پلانێکی قێزەونیان بوو، هەرزوو لەڕێی فریشتەی وەحییەوە پێغەمبەرە خۆشەویستەکەی خۆی ئاگادارکردەوە. ئیتر سەروەریشمان خۆی بۆ ڕۆژی کۆچکردنەکەی ئامادەکرد.

بەڵام سەروەرمان کە لە مەککەدا بە دەستپاك و سپاردەپارێز ناسرابوو، دەیویست ئەو سپاردانەی خەڵك لایان دانابوو بیانگەڕێنێتەوە بۆ خاوەنەکانیان. بۆ ئەم مەبەستەش حەزرەتی عەلی بانگکرد و پێی فەرموو کە خوای گەورە مۆڵەتی کۆچکردنی پێداوە و بەم نزیکانە لەگەڵ حەزرەتی ئەبوبەکردا دەکەونەڕێ. بەڵام بۆ ئەوەی بێباوەڕان

درك بە ڕۆیشتنی سەروەرمان نەکەن داوای لەم ئامۆزا خۆشەویستەی کرد کە ئەو شەوەی ئەمان کۆچ دەکەن لە پێخەفەکەیدا بنوێت. پاشانیش ئەو ئەمانەتانە بگەڕێنێتەوە بۆ خاوەنەکانیان کە لای سەروەرمان بەجێیان هێشتبوو. حەزرەتی عەلیش بە دڵخۆشییەوە داواکەی سەروەرمانی پەسەند کرد.

پێغەمبەری ئازیزمان زۆر دڵخۆش بوو بەوەی حەزرەتی عەلی قایل بوو لە جێگەکەی ئەودا بنوێت. بۆیە پێی فەرموو:

- کە من ڕۆیشتم بڕۆرە جێگاکەوە. بە یارمەتی خوای گەورە کەس زیانت پێ ناگەیەنێت.

دنیا تاریك بوو. بێباوەڕەکانیش ئابلۆقەی ماڵی پێغەمبەریان دا (د.خ). یەکێك لەبەردەم دەرگاکە و یەکێك لەبەردەم پەنجەرەکەدا و یەکێکی تریش لەبەردەم دەرگای باخچەکەدا خۆیان مەڵاسدا.

پێغەمبەری خۆشەویستمان (د.خ) ماڵئاوایی لە حەزرەتی عەلی کرد و لە خوای گەورە پاڕایەوە تا بێباوەڕان نەتوانن زیانی پێ بگەیەنن. پاشان ئایەتەکانی سەرەتای (سورەتی یاسینی) خوێند و لە ماڵ چووەدەرەوە. مشتێك خۆڵیشی لەسەر زەوییەکە هەڵگرت و دوای خوێندنی بسم الله بەسەریدا، کردی بە ڕوخساری ئەو بێباوەڕانەی لە دەرەوە وەستابوون. هەربۆیە کەسیان پێغەمبەری خوایان نەبینی کاتێك لە ماڵ چووەدەرەوە.

پاش چاوەڕوانییەکی زۆر، کە بۆیان دەرکەوت کەس لەماڵ نایەتەدەر، بێباوەڕان ئۆقرەیان لێبڕاو وتیان:

- لەوانەیە نەیەتە دەرەوە!

یەکێکی تریان لەولاوە هەڵیدایە و وتی:

- هەرچۆنێك بێت دێتەدەرەوە خۆ هەر لە ژوورەوە نامێنێتەوە!

ئیتر بەردەوام بوون لە چاوەڕوانی کردن. ئا لەم کاتەدا بوو کە یەکێك لە کۆڵانەکەدا دای بەلایاندا، کاتێك پەشۆکاوییەکەیانی بینی، ڕۆیشتە لایان و پێی وتن:

- ئەوە چاوەڕێی کێ دەکەن؟

- چاوەڕێی محەممەدین.

- دەی خۆ محەممەد لە ماڵ نییە. من لە ڕێگادا بینیم.

- ئەوە تۆ گاڵتەمان پێ دەکەیت؟ وا ئێمە ماوەیەکی زۆرە لێرە وەستاوین. مەحاڵە کەسێك هاتبێتە دەرەوە و ئێمە نەمانبینیبێت.

بەڵام پیاوەکە زۆر بە پێداگرییەوە وتی:

- پێتان دەڵێم بینیومە.

- دەڵێی بینیومە ها! ئێستا دەرگاکە دەشکێنین و دەڕۆینە ژوورەوە بزانین ئەوەی کە دەیڵێیت ڕاستە؟

دەرگاکەیان شکاند و ڕۆیشتنە ژوورەوە. بینییان وا پێخەفەکە کەسێکی تێدایە. بۆیە بە هێواشی وتیان:

- کابرا درۆی لەگەڵدا کردین سەیر بکەن هێشتا لەنێو پێخەفەکەیدایە.



ئیتر هەموو پێکەوە بە مەبەستی کوشتنی پێغەمبەر (د.خ) شمشێرەکانیان ڕاکێشا. یەکێکیان لێفەکەی بەخێرایی لەسەر لادا. بەڵام هەموویان بە سەرسوڕمانەوە وەستان. چونکە ئەوەی لە

پێخه‌فه‌که‌دا بوو حه‌زره‌تی عه‌لی بوو نه‌وه‌ك پێغه‌مبه‌ری خوا. خێرا به‌ تورڕه‌ییه‌وه‌ لێیان پرسی:

- محه‌مه‌د له‌ کوێیه‌؟

- نازانم.

- چۆن نازانی؟

زۆریان له‌ حه‌زره‌تی عه‌لی کرد به‌ڵام هیچی نه‌درکاند.

به‌هۆی ئه‌وه‌ی که‌ پلانه‌که‌یان سه‌ری نه‌گرت زۆر به‌ تورڕه‌ییه‌وه‌ ئه‌وێیان جێهێشت.

بێباوه‌ڕان چاوه‌ڕێی هه‌واڵی دڵخۆشکه‌ریان ده‌کرد. به‌ڵام به‌ فه‌رمانی په‌روه‌ردگار سه‌رتاپا پلانه‌که‌یان سه‌راوژێر بوو و سه‌ری نه‌گرت. ئه‌وان ئه‌وه‌یان له‌ یاد نه‌بوو که‌ خوای گه‌وره‌ چاودێر و به‌ئاگایه‌ له‌ هه‌موو شتێك و هه‌میشه‌ خۆشه‌ویستانی خۆی سه‌رده‌خات.

بۆ ڕۆژی دواتر حه‌زره‌تی عه‌لی سپارده‌کانی دایه‌وه‌ به‌ خاوه‌نه‌کانیان. ئیتر ئه‌میش له‌ دوای ئه‌نجامدانی کاره‌کانی به‌ره‌و مه‌دینه‌ که‌وته‌ ڕێ و به‌ دیداری پێغه‌مبه‌ری خودا شاد بووه‌وه‌.

* * *



# برایەتی

پێغەمبەری خوا لەگەڵ حەزرەتی ئەبوبەکردا سێ شەو و سێ ڕۆژ لە ئەشکەوتی سەور مانەوە. پاشان بەرەو مەدینە بەڕێکەوتن.

دوای ئەوەی حەزرەتی عەلیش کارەکانی لە مەککە کۆتایی پێهات، خۆی ئامادەکرد و کەوتەڕێ بەرەو شاری مەدینە. ئیتر پاش بڕینی ڕێگایەکی دوور و درێژ و ماندوویوونێکی زۆر، توانی لە نزیك شوێنێك کە پێی دەوترا قوبا بە خزمەتی پێغەمبەری خوا شادبێت.

پێیەکانی حەزرەتی عەلی لە دەمی کۆچکردندا ئەوەندە ئازاریان پێگەیشتبوو نەیدەتوانی لەسەریان بڕوات. بۆیە پێغەمبەری خوا هەواڵی پرسی:

- عەلی لە کوێیە؟ بۆم بانگ بکەن.

هاوەڵانی دەوری ئازیز وتیان:

- ناتوانێت بەڕێدا بڕوات ئەی پێغەمبەری خوا.

پێغەمبەری خوا (د.خ) خۆی ڕۆیشت بۆلای حەزرەتی عەلی. کە گەیشتە ئەوێ و چاوی بە تەندروستی خراپی ئەو کەوت، نەیتوانی بەر بە فرمێسکەکانی بگرێت.

پاشان دەستە موبارەکەکانی هێنا بە ژێر پێی حەزرەتی عەلیدا و لە خوای گەورە پاڕایەوە شیفای بۆ بنێرێت. خوای گەورەش شیفای حەزرەتی عەلی دا و پێیەکانی ئازاریان نەما. ئیتر دوای ماوەیەك مانەوە لە قوبا بەرەو مەدینە بەڕێ کەوتن. هەموو موسوڵمانان ڕژابوونە سەر ڕێگاکان و چاوەڕێی هاتنی پێغەمبەری خوایان دەکرد. دەروازەی شار ئێجگار قەرەباڵغ بوو.

پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێبێت) پاش گەیشتنی بۆ مەدینە چەند کارێکی زۆر گرنگ و پێویستی ئەنجامدا. یەکێك

لەوانە ئەوەبوو کە هەر کۆچبەرێکی کردە برای پشتیوانێك لە موسوڵمانەکانی مەدینە.

مەبەست لەمەش یارمەتیدانی ئەو کۆچبەرانە بوو کە ماڵ و دەرەتانی خۆیان لە پێناو ئیسلامدا لە مەککە جێ هێشتبوو.

بەڵام حەزرەتی عەلی بەتەنها مابووەوە. ئەمەشی لای پێغەمبەری خوا درکاند و وتی:

- ئەی پێغەمبەری خوا هەموویان دوو دوو بوون بە برای یەکتری، بەڵام من بەتەنها ماومەتەوە.

پێغەمبەر (د.خ) بە زەردەخەنەیەکەوە دەستی گرت و خستییە سەر سنگی و فەرمووی:

- ئایا ناتەوێت لە دنیا و قیامەتدا ببیت بە برای من؟!

حەزرەتی عەلیش لە خۆشییاندا نەیدەزانی چی بڵێت. بۆیە خێرا وەڵامی دایەوە و وتی:

- بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا. کەس هەیە داوایەکی لەم جۆرە پەسەند نەکات.

* * *



# سێیەم کەس

ڕۆژێکیان پێغەمبەری خوا دانیشتبوو. لەو کاتەدا حەزرەتی ئەبوبەکر و حەزرەتی عومەر هاتنە خزمەتی. سەرومەریشمان مژدەی بەهەشتی پێدان و دواتر پێی فەرموون:

- کەسی سێیەمیش کە دێتە ئێرە ئەویش بەهەشتییە.

ئیتر بەدەم قسەوە هەموو پێکەوە چاوەڕێی هاتنی کەسی سێیەمیان دەکرد. لە کۆتاییدا گوێیان لە دەنگی پێی یەکێك بوو. سەروەریشمان فەرمووی:

- خوایە گیان گەر تۆ ویستت لەسەر بێت دەتوانیت ئەو کەسە عەلی بێت.

خوای گەورە نزاکەی سەروەرمانی قبووڵ کرد و ئەو کەسەی هات حەزرەتی عەلی بوو. پێغەمبەر (د.خ) زۆر دڵخۆش بوو بەوە. دواتر شمشێرەکەی خۆیشی بەخشی بە حەزرەتی عەلی کە ناوی "زولفەقار" بوو.

کاتێك حەزرەتی عەلی ئەو دیارییە بەنرخەی لە شانازی مرۆڤایەتی وەرگرت بە دڵخۆشییەوە وتی:

- خوای گەورە توانای ئەوەم پێ ببەخشە کە بتوانم لە پێناوی تۆدا مافی ئەم شمشێرە بدەم و بەکاری بهێنم.

دوای ئەوەی حەزرەتی عەلی ئەو دیارییە بەنرخەی لە پێغەمبەری خوا وەرگرت وەکو چاوەکانی خۆی پارێزگاری لێدەکرد و چاوەڕێی ڕۆژێك بوو تێیدا بتوانێت لەپێناو خوای گەورەدا بەکاری بهێنێت. لە کۆتاییدا ئەو ڕۆژە هاتە پێشەوە کە چاوەڕێی دەکرد. ئەوەبوو بێباوەڕان بەمەبەستی لەناوبردنی موسوڵمانان سوپایان کۆکردبووەوە و کەوتبوونەڕێ.

شوێنی ڕووبەڕووبوونەوەی هەردوو سوپاکە لە نزیك بیرەکانی

بەدر بوو. بێباوەڕان تەواو خۆیان پڕچەك كردبوو. لەگەڵ ئەوەشدا ژمارەیان سێ هێندەی موسوڵمانان دەبوو. پێغەمبەر (د.خ) تەماشای دوژمنەكانی كرد و لە خوای گەورە پاڕایەوە و فەرمووی:

- خوایەگیان ئەگەر ئەم كۆمەڵە خەڵكە تیا بچێت، ئەوا تا ڕۆژی دوایی كەس نامێنیت بەندایەتی تۆ بكات. خوایەگیان ئەو سەركەوتنەمان پێ ببەخشە كە خۆت بەڵێنت پێ داوین.

دواجار دەمی پێكدادان هاتە پێش و هەردوو سوپا بەرامبەر یەكتر وەستان و چاوەڕێی دەسپێكردنی جەنگیان دەكرد. ئیتر ئەوەندەی نەبرد مەیدانی جەنگ بە هاواری سێ جەنگاوەری بەرەی بێباوەڕان دەنگی دەدایەوە كە دەیان وت:

- ئەوە كەس نییە ڕوویەڕوومان ببێتەوە!

پێغەمبەری خواش لە موسوڵماناندا هێمای بۆ سێ كەس كرد بڕۆن ڕوبەڕوویان ببنەوە. یەكێك لەوانەش حەزرەتی عەلی بوو.

حەزرەتی عەلی بەدەم پاڕانەوەوە لە خوای گەورەوە چووە مەیدانی جەنگەوە. ئیتر پاش ڕوویەڕوو بوونەوەیەكی كورت بەرامبەرەكەی كوشت و ئەركەكەی سەرشانی بەسەركەوتوویی جێ بەجێ كرد. حەزرەتی حەمزە و هاوەڵەكەی تریش بەرامبەرەكانیان بەزاند. بەمجۆرە هەر لە سەرەتاوە موسوڵمانان یەكەم سەركەوتنی خۆیان تۆماركرد. پێغەمبەری خوا (د.خ) زۆر بەمە دڵخۆش بوو. چونكە ئەو دەیویست ناوی بەرز و بڵندی خوای گەورە بە هەموو جیهاندا بڵاو بكاتەوە.

بەو پێیەی بێباوەڕانیش هەر لە دەستپێكی جەنگەكەوە یەكەم

دۆڕانی خۆیان تۆمارکرد، بە بارێکی دەروونی زۆر شێواو و خراپەوە هێرشیان هێنا. جەنگەکە هەتا بڵێی سەخت و دژوار بوو. چونکە ژمارەی موسوڵمانەکان زۆر لە ژمارەی بێباوەڕان کەمتر بوو. حەزرەتی عەلیش هاوشانی هاوەڵەکانی وەك شێر دەجەنگا. دۆڕانی تەواوەتی بێباوەڕان سات بەسات نزیکتر دەبووەوە تا ئەوەی ئەبوجەهلیش کوژرا. ئیتر مۆری سەرکەوتن لە لاپەڕەی مێژووی موسوڵمانان درا و بێباوەڕانیش تووشی دۆڕانێکی وەها بوون کە هەرگیز بیریان نەچێتەوە.

پاشان پێغەمبەری خوا و گشت موسوڵمانان سوپاس و ستایشی خوای گەورەیان کرد لەسەر ئەو سەرکەوتنەی پێی بەخشیبوون.

* * *

# گەنجە پاڵەوانەکە

بێباوەڕان هیچ کاتێك شکستەکانی پێشوویان لە دڵ دەرنەدەچوو. بۆیە بەردەوام سەرقاڵی پیلانگێڕی بوون بۆ لەناوبردنی موسوڵمانان. لە خەیاڵی کورتی خۆیاندا وایان دانابوو کە دەبێت موسوڵمانان بەتەواوەتی لەناو ببەن. بۆ ئەم مەبەستەش هەستان بە سوپایەکی سێ هەزار جەنگاوەرییەوە بەرەو مەدینە کەوتنەڕێ.

بەڵام کاتێك موسوڵمانان ئاگاداری هێرشی بێباوەڕان بوونەوە، هەموو ڕێوشوێنێکیان گرتەبەر و لەئەنجامی ڕاوێژ لەگەڵ سەروەرماندا بڕیاردرا خەندەق بە دەوروبەری مەدینەدا لێبدرێت. ئەمەش بیرۆکەی هاوەڵی بەڕێز سەلمانی فارسی بوو.

ئیتر کاتێك بێباوەڕان گەیشتنە نزیك مەدینە خۆیان لەبەردەم خەندەقێکی گەورەدا بینییەوە کە هەرگیز بیرییان لێنەکردبووەوە. بۆیە هەموو بە سەرسوڕماوییەوە تەماشای یەکترییان دەکرد و بەدوای ڕێگەچارەیەکدا دەگەڕان بتوانن لێوەی بپەڕنەوە بۆ مەدینە. ئیتر هەریەکە و شتێکی دەوت:

- ئێستا چی بکەین؟

- با ڕێگایەك بدۆزینەوە و لێوەی بپەڕینەوە.

- گریمان ڕێگایەکی لەوجۆرەشمان دۆزییەوە، بەڵام ئایا



کۆتاییمان بە چی دەگات ئەگەر بێت و هەموومان لەوێوە هەوڵی پەڕینەوە بدەین؟!

خاوەنی بیرۆکەکە وتی:

- بە دڵنیاییەوە ناتوانین هەموومان بەیەکجار بپەڕینەوە ئەوبەر. با سەرەتا باشترین جەنگاوەرەکانمان بپەڕنەوە. پاشان ئەوانی تریشمان بەدوایاندا دەپەڕینەوە.

هەمووان ئەم بیرۆکەیان بەدڵ بوو.

ئیتر بەو ئومێدەی شوێنێك بدۆزنەوە بتوانن لێوەی بپەڕنەوە بە بەچواردەوری خەندەقەکەدا دەستیان کرد بەگەڕان. لەپاش گەڕانێکی زۆر شوێنێکیان دۆزییەوە کە زۆر قوڵ نەکرابوو.

پاشان سێ چوار کەس لە جەنگاوەرە ئازاکانیان توانیان بپەڕنەوە ئەوبەری خەندەقەکە. یەکێك لەوانەی کە توانی بپەڕێتەوە ناوی عەمری کوڕی عەبدولوەدود بوو کە لەو سەردەمەدا بە ئازایەتی ناوی دەرکردبوو و دەیانوت لە ئازایاتەیدا هاوتای سەد پیاوی عەرەبە. عەمر هەر بەوەوە نەوەستا کە پەڕییەوە ئەوبەر بەڵکو هاواری لە موسوڵمانەکان دەکرد و بانگی دەکردن بۆ شەڕکردن.

بەردەوام هاواری دەکرد و دەیوت:

- هیچ پاڵەوانێك هەیە ڕوبەڕووم ببێتەوە؟

کاتێك کەس دەنگی لێوە نەهات، حەزرەتی عەلی بەرگەی نەگرت و بە پێغەمبەری وت (دروودی خوای لێبێت):

- ئەی پێغەمبەری خوا من ئامادەم ڕووبەڕووی ببمەوە.

پێغەمبەری خودا (د.خ) دەیزانی عەمر یەکێکە لەوانەی بە ئاسانی نابەزێندرێ بۆیە بە حەزرەتی عەلی فەرموو:

- ئەوە عەمرە.

عەمر جارێکی تر دەنگی هەڵبڕی و هەمان قسەی دووبارە دەکردەوە.

- ئەوە کەس نییە ڕوبەڕووم ببێتەوە؟! کەس نییە بیەوێت بڕوات بۆ ئەو بەهەشتەی باسی لێوە دەکەن؟!

بەم قسانەشی مەبەستی ئەوەبوو ورەی موسوڵمانان بڕوخێنێت. بۆیە حەزرەتی عەلی بەم قسانە زۆر توڕەبوو. چۆن دەبێت کەسێکی بێباوەڕ دەنگی هێند زوڵاڵ بێت؟! چیدی بەرگەی نەگرت و جارێکی تر مۆڵەتی لە پێغەمبەری خوا خواست وتی:

- ئەی پێغەمبەری خوا تکایە مۆڵەتم بدە لەگەڵیدا بجەنگم. با سنوری خۆی پێ نیشان بدەم.

دیاربوو پێغەمبەر (دروودی خوای لێبێت) دەیویست کەسێکی تر ڕووبەڕووی عەمر ببێتەوە. بۆیە ڕووی کردەوە حەزرەتی عەلی و ئەمجارەش مۆڵەتی نەدا.

عەمر زۆر دڵی خۆش بوو. دەیوت کەس نییە بوێریت ڕووبەڕووم بێتەوە. بۆیە لەبەر خۆیەوە هۆنراوەی دەخوێندەوە و بە گاڵتەجاڕییەوە قسەی دەکرد.

حەزرەتی عەلی بۆ جارێکی تر داوای مۆڵەتی لە پێغەمبەری خوا کرد و وتی:

- ئەی پێغەمبەری خوا ڕێم بدە با لێی بدەم، چی دەبێت ئەگەر عەمریش بێت.

پێغەمبەر (د.خ) لەبەردەم ئەم پێداگرییە زۆرەی حەزرەتی عەلی دا وەڵامی دایەوە و پێی فەرموو:

- بڕۆ ئەی عەلی! خوای گەورە پشتیوانت بێت.

پاشان بە دەستی موبارەکی خۆی دوو قات زرێی کردە بەری و نزای بۆ کرد. حەزرەتی عەلیش بێ کات بە فیڕۆدان چووە بەرامبەر

عەمر. عەمریش بە گاڵتەجاڕییەکەوە پرسی:

- تۆ کێیت؟

- کوڕی ئەبوتاڵیبم.

عەمر قاقایەکی لێدا و پاشان وتی:

- باوکت دۆستی من بوو. تۆ بگەڕێوە دواوە. ئەگەر هەتانە با کەسێکی تر بێت ڕوبەڕووم ببێتەوە.

حەزرەتی عەلی وتی:

- هەیە بەس دەمەوێت من ڕوبەڕووت ببمەوە.

ئیتر کە عەمر بینی وا ئەم لاوە خوێنگەرمە ڕووبەڕووی وەستاوەتەوە، یەکسەر هێرشی بۆ برد. هێرشەکەی ئەوەندە بە زەبر بوو قەڵغانەکەی حەزرەتی عەلی شکاند و سەری شمشێرەکەشی کەمێك دەم و چاوی بریندار کرد. بەڵام ئەمجارەیان حەزرەتی عەلی هێرشی برد و بە شمشێرەکەی زەبرێکی توندی لە شانی عەمر وەشاند. عەمر بەرگەی ئەو زەبرە توندەی نەگرت و تەواو ڕووخا. دوای ڕووبەڕووبوونەوەیەکی سەخت لە نێوانیاندا حەزرەتی عەلی عەمری پاڵەوانی بەزاند و ئەوانەش کە دەیانوت عەمر نابەزێنرێت زۆر سەرسامبوون بەوەی بینییان وا لاشەی عەمر لە سەرزەوی کەوتووە.

لە کاتێکدا کوژرانی عەمر بووە سەرچاوەیەکی نائومێدی بۆ بێباوەڕان، لەم لاشەوە بوو بە پاڵنەرێکی باشی دەروونی بۆ موسوڵمانەکان.

ئەوانەش کە دوای کوژرانی عەمر پەڕینەوە، بریتیبوون لە

"درار" و "حوبەیر". ئەوانیش هاوشێوەی عەمر بەرگەی زەبری شمشێرەکەی حەزرەتی عەلییان نەگرت و ڕایانکرد. یەکێکی تریش لە بەناوبانگترین جەنگاوەرانی عەرەب "نەوفەل" بوو. کە دواتر ئەویش توانی بپەڕێتەوە. بەڵام حەزرەتی عەلی ڕوبەڕووی ئەویش بووەوە و کاتێك ویستی هەڵبێت، کەوتە خەندەقەکەوە.

ئەوانەی ڕوبەڕووی حەزرەتی عەلی دەبوونەوە بە تەواوی سەریان لە ئازایەتییەکەی سوڕمابوو. دوای هەوڵێکی زۆر جەنگاوەرێکی تریش کە توانیبووی بپەڕێتەوە کەوتە جەنگ و حەزرەتی عەلی دای بە زەویدا و شمشێرەکەی لێ بەرزکردەوە بۆ ئەوەی لێی بدات. ئیتر لەو کاتەدا بێباوەڕەکە تفێکی کردە دەم و چاوی حەزرەتی عەلی.

حەزرەتی عەلی پەشیمان بووەوە و دەستی لە کوشتنی کابرا هەڵگرت و شمشێرەکەی خستەوە کێلانەکەی. ئەو جەنگاوەرەی چاوەڕێی مەرگ بوو لەبەردەم ئەم هەڵسوکەوتەی حەزرەتی عەلی دا تەواو دۆش داما. بۆیە پرسی:

- ئایا چی ڕێگری لێکردی؟ بۆچی پەشیمان بوویتەوە و نەتکوشتم؟

حەزرەتی عەلی لە وەڵامدا وتی:

- کاتێك لەگەڵت دەجەنگام لەبەر خاتری خوای گەورە بوو. بەڵام کاتێك تفت کردە دەم و چاوم نەفسم هاتە پێشەوە. واتە ئەگەر بمکوشتیتایە ئەوا لەبەر نەفسی خۆم دەمکوشتیت نەوەك خوای گەورە. هەر لەبەر ئەمەبوو لە کوشتنت پاشگەز بوومەوە.

بۆیە بێباوەڕەکە زۆر لەم کردارە جوانە سەری سووڕما و لەبەر خۆیەوە دەیوت ئەمە چ ئایینێکە تەنانەت دوژمنەکەشی ناکوژێت لەبەر ئەوەی نەفسی تێکەڵ بە نییەتەکەی بووە.

لە کۆتاییدا بێباوەڕەکان سەریان لێشێوا و نەیاندەزانی چی بکەن و چۆن بجەنگن. جگە لە ئابڵۆقەدانی مەدینە هیچ چارەیەکی تریان نەبوو. مانەوەی زۆریشیان دەبووە هۆی ماندووبوونی سوپاکەیان و پەرتەوازە بوونی لێدەکەوتەوە. لە هەمان کاتدا وەرزی زستانیش بەڕێوە بوو. بۆیە بەیانییەکیان بەفەرمانی خوای گەورە گەردەلولێکی توند هەڵی کرد و سوپای دوژمنی پەرتەوازە کرد. ئیتر ناچار بوون کە واز لە شەڕکردن بهێنن و هەڵبێن.





# من ناوی ئەو ناسڕمەوە

دوای ئەوەی موسوڵمانان کۆچیان کرد بۆ مەدینە و دەوڵەتیان دامەزراند، نەیاندەتوانی بەئاسانی سەردانی کەعبە بکەن. پێغەمبەری خوا و هاوەڵانیش تامەزرۆی دیداری ماڵی خوا بوون. بۆیە بڕیاریاندا بچن تەوافی ماڵی خوا بکەن. هەروەها جگە لە شمشێری سەفەر، کەس هیچ جۆرە چەکێکی تری لەگەڵ خۆیدا نەبرد. بەم کارەشیان دەیانویست ئەوە پیشانی دەسەڵاتدارانی مەککە بدەن کە مەبەستیان شەڕ نییە و تەنها تەوافی خۆیان دەکەن و دەگەڕێنەوە. پاشان بە پۆشاکی ئیحرامەوە لە دووری ڕۆژەڕێیەك لە مەککەوە مۆڵیان دا.

کاتێك هەواڵ گەیشتە مەککە، بێباوەڕان بەپرتاو کۆبوونەوە. هەر لەوێشدا بڕیاریاندا بەهیچ شێوەیەك ڕێ بەهاتنەناوەوەی موسوڵمانان نەدەن. ئەمەش سەرباری ئەو هەموو نیەت پاکییەی کە پێغەمبەری خوا پیشانیدا، بەڵام ئەوان لە بڕیارەکەی خۆیان پاشگەز نەبوونەوە.

پاشان لە کۆتاییدا بڕیار لەسەر ئاشتی درا و ئەو ساڵە موسوڵمانان تەوافی کەعبەیان نەکرد. دواتر بێباوەڕانیش بە نوێنەرایەتی سوهەیل هاتن بۆ واژۆکردنی ڕێککەوتننامەکە. پێغەمبەری خواش ئەرکی نووسینی ڕێکەوتننامەکەی سپارد بە حەزرەتی عەلی و فەرمووی بنووسە.

حەزرەتی عەلیش قەڵەمەکەی گرت بە دەستییەوە و نووسی (بسم الله الرحمن الرحيم) جارێ ڕستەکەی تەواو نەکردبوو کە دەنگی ناڕەزایی سوهەیل بەرزبووەوە.

- نابێت بنوسیت (بسم الله الرحمن الرحيم) چونکە ئەگەر باوەڕمان پێی هەبوایە ئەوا هەر لە سەرەتاوە دژایەتیمان نەدەکردن و لەگەڵتان بەشەڕ نەدەهاتین.

هەرچی سەرەوەریشمانە مەبەستی بوو ڕێککەوتننامەکە واژۆبکرێت و ئاشتی بەرقەراربێت. بۆیە کاتێك ئەم ناڕەزاییەی سوهەیلی بینی، بە حەزرەتی عەلی فەرموو:

- بنوسە ئەم ڕێککەوتنە لە نێوان محەممەد پێغەمبەری خوا و سوهەیلدایە.

حەزرەتی عەلی بە دڵشکاوییەوە ئەوەی پێی دەوترا دەینووسی. بەڵام دیسان جارێکی تر دەنگی ناڕەزایی سوهەیل بەرزبووەوە و وتی:

- نابێت بنووسیت محەممەد پێغەمبەری خوا، ئەگەر ئێمە باوەڕمان پێ بکردیتایە ئەوا بێگومان لەگەڵت نەدەجەنگاین.

جارێکی تر پێغەمبەر (د.خ) ڕووی کردەوە حەزرەتی عەلی و فەرمووی:

- ئەوە بسڕەوە و لە شوێنیدا بنوسە ئەم ڕێککەوتنە لە نێوان محەممەدی کوڕی عەبدوڵلا و سوهەیلی کوڕی عەمردایە.

حەزرەتی عەلی هەرگیز نەیدەتوانی وشەی "پێغەمبەری خوا" بسڕێتەوە. بۆیە تەماشایەکی پێغەمبەری خوای کرد و بە ڕوخساریدا دیاربوو دەیوت چۆن شتی وا دەبێت؟!!

حەزرەتی عەلی وتی:

- ئەی پێغەمبەری خوا بەدرێژایی ژیانم هەوڵم بۆ ئەوە داوە کە ناوی تۆ بدەم بەگوێی جیهاندا. ئێستا چۆن ڕێ بەخۆم بدەم ئەم وشەیە بسڕمەوە! ناتوانم ئەوە بکەم ئەی پێغەمبەری خوا.

بۆیە پێغەمبەر (د.خ) داوای کرد شوێنی وشەکەی پێ پیشانبدەن و خۆی قەڵەمەکەی وەرگرت و سڕییەوە و وتی بە حەزرەتی عەلی لە بری پێغەمبەری خوا بنووسێت "محەممەدی کوڕی عەبدوڵلا".

دیارە حەزرەتی عەلی لەبەر خۆشەویستی زۆری بۆ پێغەمبەری خوا نەیتوانی بەو کارە هەڵبستێت.

بەپێی ڕێککەوتنەکە دەبووایە هەردوولا بۆ ماوەی دە ساڵ جەنگ لەنێوانیاندا ڕابگرن. هەروەها دەبووایە موسوڵمانەکان ساڵی داهاتوو تەوافی کەعبە بکەن و ئەمساڵ بگەڕێنەوە. ئەگەر هاتو کەسێك لە

خەڵکی مەککە موسوڵمان ببوایە و بڕۆشتایە بۆ مەدینە، دەبوایە بگەڕێندرایەتەوە بۆ مەککە. لە ڕواڵەتدا وا دیاربوو کە بەندەکانی ڕێککەوتننامەکە زۆر قورس بن و لەبەرژەوەندی موسوڵماناندا نەبن. بەڵام پێغەمبەر (درودی خوای لێبێت) ئەم ڕێککەوتنەی بۆ داهاتووی ئیسلام زۆر بە گرنگ دەبینی. چونکە بەم ڕێککەوتنە، خەڵکی مەککە دانیان نا بە دەوڵەتی موسوڵماناندا. بەپێی ڕێککەوتنەکە موسوڵمانەکان دەیانتوانی بۆ هەرکوێیەك بیانەوێت بڕۆن و ئەمەش دواتر بووە هۆی ناساندنی ئایینی پیرۆزی ئیسلام بە ناوچەکانی دەوروبەر.

لەو کاتەشدا سورەتی "فەتح" دابەزی و تێیدا مژدەی فەتحێکی گەورە بە موسوڵمانان درا.

* * *



# چاکە

ڕۆژێکیان پێغەمبەری خوا لەگەڵ هاوەڵاندا دانیشتبوو و قسەی بۆ دەکردن. یەکێک لە هاوەڵان بە سەرومرمانی وت:

- ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە هەموو دەزانین کە چەندە حەزرەتی عەلیتان خۆش دەوێت. ئایا دەتوانین هۆکاری ئەمە بزانین؟

پێغەمبەری خوا فەرمووی ئێستا پێتان دەڵێم. پاشان یەکێک لە

هاوەڵانی نارد بە دوای حەزرەتی عەلیدا. دواتر ڕووی کردە هاوەڵان و لێی پرسین:

- ئەگەر چاکەتان بەرامبەر کەسێك کرد و ئەویش لەبەرامبەردا خراپەی لەگەڵ کردنەوە چی دەکەن؟

- هەر چاکەی لەگەڵ دەکەین.

- ئەی ئەگەر دووبارە خراپەی لەگەڵ کردنەوە؟

- هەر چاکەی لەگەڵ دەکەین.

- ئەی ئەگەر هەر خراپەی لەگەڵ کردنەوە؟

هاوەڵان سەریان داخست و وەڵامیان نەدایەوە کە ئەمەش مانای ئەوە بوو دوای ئەو هەموو چاکەیە جارێکی تر چاکەی لەگەڵ ناکەنەوە.

لەم کاتەشدا حەزرەتی عەلی گەیشت و پێغەمبەری خۆشەویستمان (د.خ) هەمان ئەو پرسیارەی لە هاوەڵانی کرد لە حەزرەتی عەلیشی کرد:

- ئەی عەلی ئەگەر چاکەت لەگەڵ یەکێك کرد و ئەویش لەبەرامبەردا خراپەی لەگەڵ کردیت چی دەکەیت؟

- چاکەی لەگەڵ دەکەم.

- ئەگەر دووبارە خراپەی لەگەڵ کردی؟

- هەر چاکەی لەگەڵ دەکەم.

- ئەی ئەگەر هەر خراپەی لەگەڵ کردی؟

- هەر چاکەی لەگەڵ دەکەم.

پێغەمبەر (د.خ) ئەم پرسیارەی حەوت جار دووبارە کردەوە لە هەموو جارەکاندا وەڵامی دەدایەوە و دەیوت هەر چاکەی لەگەڵ دەکەم.

هاوەڵان وتیان:

تەواو پێغەمبەری خودا ئێستا تێگەیشتین کە بۆچی ئەوەندە حەزرەتی عەلیت خۆش دەوێت.

* * *

# ئاڵا

خەیبەر یەکێکە لەو جەنگانەی کە لە مێژووی ئیسلامدا گرنگی خۆی هەیە. لە ساڵی حەوتەمی کۆچیدا پێغەمبەری خوا فەرمانی کرد سوپایەك ئامادەبکرێت بۆ گرتنی قەڵای خەیبەر. ئیتر پاش تەواوبوونی ئامادەکارییەکانی جەنگ، پێغەمبەری خوا سوپاکەی خستە جووڵە و بەرەو خەیبەر بەڕێ کەوتن. یەهودییەکان لە قەڵای خەیبەر دەژیان، هەرکاتێکیش دەرفەتێکیان چنگ بکەوتایە ئەوا یەکسەر بێباوەڕان و هۆزەکانی تریان دژی موسوڵمانان هاندەدا و هەمیشە سەرقاڵی نانەوەی ئاژاوە و دووبەرەکی بوون.

ئەم قەڵایە لەسەر بەرزاییەکانی ناوچەکە دروستکرابوو. بۆیە گەیشتن پێی و چوونە ناوەوەی کارێکی هەروا ئاسان نەبوو.

دانیشتوانی قەڵاکە بە گەیشتنی ئەو سوپا بەهێزەی موسوڵمانان تەواو شپرزەبوون و خێرا کەوتنە خۆیان و دەروازەکانی قەڵاکەیان داخست. ئیتر هێرشکردنە سەر قەڵاکە چەندین ڕۆژی خایاند. دیاربوو قەڵاکە هەروا بەئاسانی نەدەگیرا. بۆیە ڕۆژێکیان پێغەمبەر (د.خ) هاوەڵانی کۆکردەوە و پێی فەرموون:

- بەیانی ئاڵاکە دەدەم بە کەسێك کە خوای گەورە لەسەر دەستی ئەودا فەتحی قەڵاکەمان پێ دەبەخشێت. ئەو کەسە خوای گەورە و پێغەمبەری خوای خۆش دەوێت و خوای گەورە و پێغەمبەرەکەشی ئەویان خۆش دەوێت.

هەموو هاوەڵان بەتاسەوە چاوەڕێی ڕۆژی دواتریان دەکرد. ئەو شەوە کەس خەو نەچووە چاوی. هەمووان بیریان لەوە دەکردەوە کە بڵێیت کێ ئاڵاکە وەربگرێت؟!

ڕۆژ بوویەوە و کاتی چاوەڕوانکراو هاتە پێشەوە. هاوەڵان هەموو چاویان لە لێوی پێغەمبەری خوا بوو و ئارەزووی ئەوەیان دەکرد کە ناوی خۆیان لە دەمی موبارەکیەوە ببیستن و ئەو ئەرکە پیرۆزەیان پێ بسپێردرێت. پاشان کاتێك پێغەمبەر (درودی خوای لێبێت) چاوی بەناو هاوەڵاندا گێڕا، دیاربوو ئەو کەسەی ئەو دەیویست لەوێ ئامادە نەبوو. پاشان پرسی:

- عەلی لە کوێیە؟

ئیتر هاوەڵان بۆیان ڕوون بووەوە کە پێغەمبەری خوا ئاڵاکە دەداتە دەست کێ.

- عەلی نەخۆشە.

پێغەمبەر (د.خ) فەرمووی:

- بچن بۆم بانگ بکەن.

پاشان حەزرەتی عەلییان بانگکرد و ئەویش هات. پێغەمبەری خواش داوای شیفای لەخوای گەورە بۆ کرد و تەندروستی باش بوو.

دوای ئەوەی خوای گەورە شیفای بۆ حەزرەتی عەلی نارد و چاك بووەوە، پێغەمبەری خواش ئاڵای موسوڵمانانی پێدا. لەو ساتەدا هەموو کەسێك خۆزگە و ئاواتی دەخواست کە لەجێی حەزرەتی عەلی بووایە و ئەو ئەرکە پیرۆزەی پێ بسپێردرایە.

کاتێك حەزرەتی عەلی ئاڵاکەی وەرگرت، خۆشەویست پێی فەرموو:

- سەرەتا بانگیان بکە بۆ سەر ئایینی ئیسلام. ئەگەر پەسەندیان نەکرد ئینجا لەگەڵیان بجەنگە. لە پاش ئەمەش فەرمووی "ئەی عەلی ئەوەش بزانە کە ئەگەر بێت و خوای گەورە لەسەر دەستی تۆدا هیدایەتی کەسێك بدات ئەوا پاداشتت لەو کەسە زیاترە کە هێندەی دۆڵێك وشتر لەپێناو خوای گەورەدا دەبەخشێت."

ئیتر حەزرەتی عەلی ئاڵاکەی هەڵگرت و چووە پێشی سوپاکەوە. پاشان سێ جەنگاوەر لە یەهودییەکان و سیانیش لە موسوڵمانان بەرامبەر یەکتر وەستانەوە. لە پاش ڕووبەڕووبوونەوەیەکی سەخت موسوڵمانەکان توانیان بەرامبەرەکانیان ببەزێنن و شکستیان پێبهێنن.

دوای ئەم ڕووبەڕووبوونەوەیەش بەناوبانگترین جەنگاوەری خەیبەر کە ناوی مەرحەب بوو و، لەو کاتەدا دوو زرێی پۆشیبوو، هاتە مەیدانەکەوە. دیارە مەبەستی تەنها تۆڵە کردنەوە بوو بۆیە بە هەموو توانایەکییەوە هاواری کرد و وتی:

- ئایا کەس نییە بێتە بەرامبەرم؟

حەزرەتی عەلی شمشێرەکەی ڕاکێشا و شێرئاسا لێی چووە پێشەوە.



ئەم جۆرە ڕووبەڕووبوونەوانە شتێكی نامۆ نەبوو بۆ حەزرەتی عەلی، چونكە پێشتریش شكستی بە عەمر هێنابوو كە لەناو عەرەبدا بەوە ناوبانگی دەركردبوو كە دەتوانێت ڕووبەڕووی سەد پیاو ببێتەوە. بێگومان ناكامی مەرحەبیش هیچ جیاواز نەبوو لەوەی عەمر. بۆیە پاش ململانێیەكی كورت مەرحەب بە زەبرێكی شمشێرەكەی شێری خودا كەوتە سەرزەوی.

كاتێك پێغەمبەری خوا چاوی بەم دیمەنە كەوت، بە هاوەڵانی چواردەوری خۆی فەرموو:

- دڵتان خۆش بێت چونکە ڕزگارکردنی خەیبەر ئاسان بوو.

ئیتر ئەوەندەی نەبرد هەردوو سوپاکە ڕووبەڕووی یەکتربوونەوە و بە هەموو توانایەکیانەوە هێرشیان دەبرد. لە گەرمەی جەنگەکەدا حەزرەتی عەلی شمشێرەکەی لەدەست کەوتە خوارەوە. بۆیە ئەو هاوەڵانەی ئەمەیان بینی ترسان لەوەی حەزرەتی عەلی شتێکی بەسەربێت. ئیتر حەزرەتی عەلی "الله اکبر"ی کرد و دەرگا گەورەکەی قەڵای خەیبەری بەرزکردەوە و دەرگاکە بوو بە قەڵغان بۆی. ئیتر ئەو کۆمەڵە جەنگاوەرەی هێرشیان بۆ هێنابوو پەرتەوازە بوون و هەریەکەیان کەوتن بەلایەکدا.

ئەو هاوەڵانەی حەزرەتی عەلی یان بەمجۆرە بینی تەواو گەشانەوە و جارێکی تر ورەیان بەبەردا هاتەوە. ئیتر دوژمن لەوە زیاتر بەرگەی ئەو هێرشە بەزەبرانەی نەگرت و ئەوەندەی نەبرد خەیبەر ڕزگارکرا. ئەمەش جارێکی تر پشتڕاسکردنەوەی ئەو هەواڵەی سەروەرمان بوو کە پێش جەنگەکە پێی ڕاگەیاندبوون. دوای جەنگەکە ڕافیعی هاوەڵی پێغەمبەر (دروودی خوای لێبێت) کە زۆر سەرسامبوو بە دەرگا بەرزکردنەوەکەی حەزرەتی عەلی، بە خۆی و حەوت هاوەڵی دییەوە نەیانتوانی دەرگاکە لە شوێنی خۆی بجووڵێنن. دواجار دەرگاکە بە چل کەسەوە بەرزکرایەوە.

* * *

# ئازاری جودایی

دە ساڵ تێپەڕیبوو بەسەر کۆچکردنی پێغەمبەری خودادا بۆ مەدینە. لەم دە ساڵەدا ئایینی ئیسلام بەناو نیمچەدوورگەی عەرەبدا بڵاو بوبووەوە. لە دوو ساڵی کۆتاییدا بە هەزاران کەس هاتبوونە مەدینە و ئیسلامیان پەسەند کردبوو و موسوڵمان ببوون.

ئەو ساڵە پێغەمبەر (د.خ) بڕیاری حەج کردنی دا. دەیویست هەموو موسوڵمانەکانیش بەشداری ئەم حەجە بکەن.

حەزرەتی عەلی لە دەمی ئەم بانگهێشتەدا لە یەمەن بوو. ئەو بەتایبەتی لەلایەن پێغەمبەری خوداوە نێردرابوو بۆ یەمەن بەمەبەستی بانگەوازکردن بۆ ئایینی ئیسلام. حەزرەتی عەلییش ماڵ بە ماڵ دەگەڕاو بانگهێشتی دەکردن بۆ سەر ئایینی ئیسلام.

هەر کە هەواڵەکەی بیست خێرا بەرەو مەککە بەڕێ کەوت. کۆمەڵێك خەڵکی تازە موسوڵمانیشی لەگەڵدا بوو. زیاد لە سەد هەزار حاجی لە مەککە کۆ ببوونەوە. ئەم حەجە یەکەمین و کۆتا حەجی پێغەمبەر بوو (دروودی خوای لێبێت). لەوێ "وتاری ماڵئاوایی" خوێندەوە و ئامۆژگاری موسوڵمانانی کرد.

لە دەمی حەجی ماڵئاواییدا خوای گەورە ئایەتێکی ناردە خوارەوە کە دەفەرموێت: ”ئەمڕۆ ئایینەکەم بۆ تەواوکردن و ئەو نیعمەتەم

بۆ تەواوکردن کە دابووم بە موسوڵمانەکان.“

لە پاش حەجی ماڵئاوایی پێغەمبەر (د.خ) گەڕایەوە مەککە. سەر ئێشەیەکی زۆر بەهێزی تووش بوو. ئازارەکەی هەر لە زیاد بووندا بوو. موسوڵمانان زۆر دڵگران بوون بە نەخۆشییەکەی پێغەمبەر (د.خ). ئیتر ئەوەبوو پێغەمبەر (د.خ) ڕۆشتە مزگەوتی نەبەوی بۆلای هاوەڵەکانی و وتاری بۆدان.

لەپاش ئەو ڕۆژەوە هاوەڵەکان پێغەمبەری خۆشەویستیان نەبینییەوە. پێغەمبەری خۆشەویستمان لەگەڵ خێزانەکەیدا مایەوە.

پێغەمبەری ئازیزمان سیازدە ڕۆژ بە نەخۆشی کەوت لە جێگادا. لە کۆتاییدا کاتی بەیەکگەشتنەوەی هات لەگەڵ خوای گەورەدا لە کاتێکی ئێوارەدا رۆحی بەخشییەوە بە خوای گەورە. حەزرەتی ئەبوبەکر هەردوو چاوەکانی ببوون بە گۆمی فرمێسك. بۆ دواجار تەماشای پێغەمبەری خودای کرد و وتی:

- کە لەژیاندا بویت چەندە جوان بوویت ئێستاش ئەوەندە جوانیت.

موسوڵمانەکان تەواو شان و باڵیان شکابوو حەزرەتی عومەر خۆی لەدەست دابوو.

- دەیوت کێ بڵێت پێغەمبەر مردووە (د.خ) ملی دەپەڕێنم.

حەزرەتی ئەبوبەکر فەرمووی: ”هەرکێ پێغەمبەری دەپەرست ئەوا پێغەمبەری خودا کۆچی دوایی کرد. وە هەرکێ خوای گەورەی دەپەرست ئەوا خوای گەورە ماوە و نامرێت.“ وە لەدوای ئەمەش ئەم ئایەتەی خوێندەوە. ”ئەی محمد بێگومان تۆش دەمریت و ئەوانیش



دەمرن."

حەزرەی عەلیش بە کۆچی دوایی سەرداری سەرداران وەکو مۆم دەتوایەوە. لە سایەی ئەوەدا نەرۆشتبووە سەر هیچ ئایینێکی تر جگە لە ئیسلام و لەبەردەم هیچ بتێکدا نەنوشتابووەوە. هەرچییەك فێربووە لەوەوە فێر بووە و هەرچییەکی بینیوە لەگەڵ ئەودا بینیبووی. بەو ناوەدا دەگەڕاو نەیدەزانی چی بکات کە لە ناکاو گوێی لە دەنگێك بوو یەکێك بانگی کرد و ووتی:

-ئەی عەلی لە کوێی؟

ڕێگەی بۆ کرایەوە لە قەرەباڵغییەکەدا و حەزرەتی عەلی بەرەو ئەو شوێنە ڕۆشت کە دەنگەکەی لێوە دەهات.

وتی فەرموو.

-ئێستا کاتی بەجێهێنانی وەسییەتەکەی پێغەمبەرە (د.خ). پێغەمبەری خوا وەسییەتی کردووە کە تۆ بیشۆیت لە دوای مردنی، ئێستاش وەختی بەجێهێنانی وەسییەتەکەیەتی.

حەزرەتی عەلی هیچی نەوت و ڕۆیشت بۆلای جەستەی موبارەکی سەرداری سەرداران بۆئەوەی ئەو ئەرکە پیرۆزە جێبەجێ بکات و جەستەی موبارەکی حەزرەتی پێغەمبەر (د.خ) بشوات. نازانرێ ئەو جەستە موبارەکە بە ئەسرینەکانی حەزرەتی عەلی شۆردرا یاخود بەو ئاوەی پیایدا دەکرد.

حەزرەتی عەلی لەسەر وەسییەتەکە، پێغەمبەرمانی شۆرد. لە کاتێکدا کە زۆر حاڵی پەرێشان بوو و لە دنیا بێئاگا ببوو، پێی نا بەو ئاگرە جودابییەی کە لە دڵیدا هەڵکرابوو و خستییە ناو گۆڕەکەوە.

کچەکەی پێغەمبەرمان حەزرەتی فاتیمە دەگریا:

-چۆن دڵتان ڕێگەتان پێ دەدات کە خۆڵ بکەن بەسەر پێغەمبەری خوادا؟؟!!...

حەزرەتی عەلی بە زۆر پێی نا بەو ئاگری دابڕانەی کە لە دڵیدا هەڵکرابوو، ناچاربوو کە دڵنەوایی خێزانە خۆشەوسیتەکەی بکات.

ئەو ئیتر نەمابوو. ئەرکەکەی خۆی جێبەجێکردبوو و بەرەو

نیشتمانی ڕاستی خۆی گەڕابووەوە و بەخوای خۆی شاد بووەوە.

پێغەمبەری خۆشەویستمان (د.خ) باشترینی مرۆڤەکان بوو، جوانترینی مرۆڤەکان بوو، چاکەکارترینی مرۆڤەکان بوو. مایەی شانازی بوونەوەران بوو. بەڵام ئەویش لە کۆتاییدا مرۆڤێك بوو، وەکو حەزرەتی ئەبوبەکر دەیوت، دەبوایە ماڵئاوایی لەدنیا بکردایە. بەهۆی کۆچکردنیشییەوە موسوڵمانان بێ پێشەوا مابوونەوە.

موسوڵمانەکان کۆ بوونەوە و بڕیارایاندا جێنشینێك بۆ خۆیان هەڵبژێرن. حەزرەتی ئەبوبەکر فەرمووی:

- ئەی خەڵکینە، ئەوەی کە بە دڵی مندا دێت حەزرەتی عومەر یان عوبەیدەیە.

حەزرەتی عومەر و عوبەیدە وتیان:

- نەخێر ئەی ئەبوبەکر! تۆ لە ئێمە شیاوتری، بێنە دەستت با بەیعەتت بدەینێ.

ئەو موسوڵمانانەش کە لەوێ بوون هەموویان حەزرەتی ئەبوبەکریان دەویست لەبەر ئەوە حەزرەتی ئەبوبەکر هەڵبژێردرا.

حەزرەتی عەلیش بۆ ڕۆژی دواتر ڕۆشتە لای حەزرەتی ئەبوبەکر و هیوای سەرکەوتنی بۆ خواست.

* * *



# دە قاتی قازانج

حەزرەتی عەلی هەر دەرفەتێکی بدۆزییایەتەوە حەسەن و حوسەینی هەڵدەگرت و دەیگێڕاندن بەناو شوێنە خۆشەکانی مەدینەدا.

لە یەکێك لەو گەڕانانەدا، بەدەم قسەکردنەوە بەڕێدا دەڕۆیشتن. حەسەن و حوسەین پرسیاریان لە باوکیان دەکرد دەربارەی ئەو شوێنانەی کە دەیانبینین. حەزرەتی عەلیش لە ناخەوە وەڵامی پرسیارەکانیانی دەدانەوە. بەمجۆرە کە بە ڕێگاکەیاندا بەردەوام بوون پیاوێکی پیر هاتە ڕێیان. زۆر ماندوو دیاربوو. لێیان نزیك بووەوە و وتی:

- زۆرم برسییە و ئەمڕۆ نانم نەخواردووە، یارمەتیم دەدەن؟

حەسەن و حوسەین وتیان:

- با یارمەتی ئەو مامەیە بدەین ئەها ئەڵێت برسیمە!

حەزرەتی عەلیش هەمان ڕای منداڵەکانی هەبوو. دەیزانی کە پیاوەکە بەڕاست پێویستی بە یارمەتی هەیە بۆیە دەستی کرد بە گیرفانەکانیدا. چاوی پیرە پیاوەکە لە خۆشیاندا دەبریسکایەوە. لە ناخەوە دەیوت لە کۆتاییدا یەکێکم دەستکەوت کە هاریکاریم بکات.

حەزرەتی عەلی هەموو گیرفانەکانی گەڕا بەڵام هیچی نەدۆزییەوە، تەماشایەکی کابرای کرد و وتی:

- لەبیرم چووە پارە هەڵگرم لەگەڵ خۆم.

ڕوخساری پیاوە پیرەکە گۆڕاو زۆر بێزاربوو. چونکە چەند ڕۆژێکە برسییە. ئەگەر لە بارێکی زۆر خراپدا نەبووایە داوای یارمەتی لەکەس نەدەکرد.

حەزرەتی عەلی وتی:

-ئەگەر چاوەڕێ دەکەیت لێرە، منداڵەکان دەنێرم پارەت بۆ بهێنن.

پیاوە پیرەکە بە شەرمێکەوە وتی:

-چاوەڕێ دەکەم.

حەزرەتی عەلی ڕوویکردە حەسەن و حوسەین و وتی:

- دەی کوڕەکانم ئەو شەش درهەمەی لای دایکتان دامناوە بۆم بهێنن.

حەزرەتی حەسەن و حوسەین کە زۆر پەرۆشی حاڵی مامەپیرە

بوون، وتیان:

- باشه بابه گیان.

ئەمەیان وت و بەڕاکردن بەرەو ماڵەوە گەڕانەوە.

بەخێرایی لەدەرگایان دا، دایکیان حەزرەتی فاتیمە دەرگاکەی لێکردنەوە. کە منداڵەکانی بەتەنیا بینی، بە پەشۆکانەوە پرسیاری لێکردن:

-خێرە منداڵان چی ڕوویداوە؟ ئەی باوکتان لە کوێیە؟

- باوکم چاوەڕێمان دەکات ئەو پارەیەی دەوێت کە بەیانی دابووی بە تۆ.

- چی لەو پارەیە دەکات؟

- دەیدات بە کابرایەکی پیر کە زۆر پێویستی بە یارمەتییە. دایە گیان با بیدەینێ!!!

- دەیدەینێ بەڵام لە ماڵەوە ئاردمان هیچ نەماوە. باوکتان ئەو پارەیەی بۆ ئارد کڕین دابوومێ. بڕۆنەوە دووبارە لێی بپرسنەوە نەوەك لەبیری چووبێتەوە کە دەمێت ئارد بکڕین.

منداڵەکان وتیان "باشە". ئینجا چۆن هاتبوون ئاوا گەڕانەوە. حەزرەتی عەلی وتی:

- پارەکەتان هێنا؟

حەسەن:

- بابە دایکم وتی ئەو پارەیەی بۆ ئارد کڕین داومەتێ، لێی

بپرسن بزانە ڕای گۆڕیوە یان لەسەر ئارد کڕینەکە سوورە.

حەزرەتی عەلی نەیدەویست ئومێدی پیاوە پیرەکە بەهەدەر بدات، بۆیە ڕووی کردەوە منداڵەکانی و وتی:

-منداڵەکان بڕۆن بۆلای دایکتان و پێی بڵێن ئەو پارەیە لە کارێکی خێرتردا بەکار دەهێنین.

منداڵەکان جارێکی تر ڕۆشتنەوە لای دایکیان و قسەکەی باوکیان پێگەیاند. حەزرەتی فاتیمە ئەمجارەیان هیچی نەوت، یەکسەر پارەکەی لە ژوورەوە هێناو دای بە منداڵەکان. منداڵەکان پارەکەیان وەرگرت و گەڕانەوە و دایان بە باوکیان. حەزرەتی عەلی پارەکەی وەرگرت و دای بە پیاوە هەژارەکە. پیاوەکە نزای بۆ کردن و لەوناوە دوورکەوتەوە.

حەزرەتی عەلی پاش ماوەیەك گەڕانی تر لەگەڵ منداڵەکانیدا گەڕانەوە ماڵەوە. کە گەیشتنە لای دەرگای ماڵەوە، پیاوێك بە حوشترێکەوە لێیان نزیك بوویەوە و سڵاوی لێ کردن.

حەزرەتی عەلی لە پیاوەکەی پرسی:

- لە کوێوە هاتوویت و بۆ کوێ دەڕۆیت؟

- ئەڕۆم ئەم حوشترەی کە دەیبینی بیفرۆشم. ئەگەر دەتەوێت با پێت بفرۆشم؟

- بەچەند دەیفرۆشیت؟

- بە سەد و چل درهەم.

ئەم پارەیە بۆ ئەو حوشترە گەورە و جوانە زۆر کەم بوو. حەزرەتی عەلی ماوەیەك بیری کردەوە و بە کابرای وت:

- دەمویست بیکڕم بەڵام ئێستا پارەم پێ نییە. ئەگەر بەوە ڕازی بیت دواتر پارەکەت بدەمێ دەمەوێت بیکڕم.

پیاوەکە وتی:

- ئەی عەلی ئەگەر یەکێکی تر بووایە پێم نەدەفرۆشت. بەڵام تۆ کەسێکی باوەڕپێکراوی. لەبەر ئەوە پێت دەفرۆشم. دواتر دەتوانی پارەکەم بدەیتەوە.

ڕێکەوتن و کابرا حوشترەکەی بە داری بەردەم ماڵەکەوە بەستەوە و ڕۆشتن. حەزرەتی عەلی هێشتا نەڕۆشتبوویە ژوورەوە لەگەڵ منداڵەکانیدا تەماشای حوشترەکەیان دەکرد.

پیاوێکی تر هات بە لایاندا و سڵاوی لێ کردن و تەماشایەکی حوشترەکەی کرد و پرسی:

-چەندە حوشترێکی جوانە، زۆر پێویستم بە حوشترێکی وایە، پێم دەفرۆشن؟

حەزرەتی عەلی وتی:

-بەڵێ دەیفرۆشم.

پیاوەکە سەری حوشترەکەی گرتبوو و سەیری دەکرد و بە دڵی بوو. بە حەزرەتی عەلی وت:

- بە چەند دەیفرۆشیت؟

- دوو سەد درهەم.

-وتی باشە ڕازیم، کابرا دووسەد درهەمی لە گیرفانی دەرهێنا و دایە دەست حەزرەتی عەلی. پاشان حوشترەکەی برد و ڕۆشت.

حەزرەتی عەلی کە پارەکەی لە کابراکە وەرگرت منداڵەکانی ناردە ژوورەوەو خۆی ڕۆشت بۆلای ئەو کابرایەی کە حوشترەکەی لێکڕیبوو. پیاوەکەی دۆزییەوە و پارەکەی دایەوە.

کە گەڕایەوە ماڵەوە زۆر دڵی خۆش بوو و بە حەزرەتی فاتیمەی وت:

-ئادەی دەستت بکەرەوە.

حەزرەتی فاتیمە بەپەرۆشییەوە هەردوو دەستی کردەوە و چاوەڕێی دەکرد. حەزرەتی عەلی شەست درهەمەکەی کە لە فرۆشتنی حوشترەکە قازانجی کردبوو، خستییە دەستی حەزرەتی فاتیمەوە.

حەزرەتی فاتیمە بە سەرسوڕمانەوە سەیری پارەکەی کرد و وتی:

- ئەمە لە کوێوە هات ئەی عەلی؟!! بەیانی کە شەست درهەمەکەت دامێ وتت "ئەمە هەموو پارەکەمانە."

حەزرەتی عەلی وتی:

- تا ئەو کاتەی شەست درهەمەکەم دا بە پیاوە هەژارەکە وەها بوو ئەی فاتیمە.

- یانی چۆن؟

حەزرەتی عەلی ئەوانەی بەسەری هاتبوون یەك بە یەك بۆ

خێزانەکە گێڕایەوە. بە حەزرەتی فاتیمەی وت:

- لە پێغەمبەرەوە بیستوومە (دروودی خوای لێبێت)، خوای گەورە پێی فەرمووە "هەرکەسێك چاکەیەك لەگەڵ کەسێکدا بکات دە هێندەی ئەو چاکەیەی پێ دەدرێتەوە."

حەزرەتی فاتیمە وتی:-

-کەواتە تۆ ئەمڕۆ چاکەیەکت کرد و دە قاتی چاکەکەت وەرگرتەوە.

حەزرەتی عەلی وتی:

-بەڵێ ڕێك وابوو.

هەموویان سوپاسی خوای گەورەیان کرد لەسەر ئەو بەخششانەی کە خوای گەورە پێی بەخشیبوون.

* * *



# ئەرکێکی قورس

لەگەڵ شەهیدکردنی حەزرەتی عوسماندا، ئاسمانی مەدینە بە پەڵەرەشی هەور داگیرابوو. هەڵگەڕاوەکان لەناو مەدینەدا بوون و مەدینەیان جێنەهێشتبوو. بەهۆی هەڵنەبژاردنی جێنشینی نوێوە ناکۆکییەکان بەردەوام بوو.

بکوژەکانی حەزرەتی عوسمان بەسەربەستی دەسووڕانەوە. تاقمێکیش ئەوان و هەڵگەراوەکانی دەپاراست.

کەسێکی وەکو حەزرەتی عەلی کە نەیدەویست ئەو ئەرکە قورسەی جێنشینی وەربگرێت، لەناو مەدینەدا نەدەمایەوە و دەیویست چاوەکان

نەیبینن و دەرنەکەوێت بۆیە دەڕۆشتە باخی دارخورماکانەوە و کاتەکانی لەوێ بەسەر دەبرد.

بەڵام خەڵك دەیانویست ئەو لە پێش خۆیانەوە ببینن. ئەمەشیان لە دانیشتنی جیا جیادا باس دەکرد. پێنجەمین ڕۆژ بوو لە دوای شەهیدکردنی حەزرەتی عوسمان. حەزرەتی عەلی بۆ نوێژی هەینی ڕۆشتبوو بۆ مزگەوت. ئەوانەی لەوێ بوون هەموویان بەیعەتیان دا بە حەزرەتی عەلی واتە ئەویان وەکو جێنشین هەڵبژارد.

حەزرەتی تەڵحەی کوڕی عوبەیدوڵڵا و حەزرەتی زوبەیری کوڕی عەوامیش لەوێ بوون. کە پێشتر حەزرەتی عومەر رایسپاردبوون بۆ هەڵبژاردنی جێنشین. ئەوانیش بەیعەتیان بە حەزرەتی عەلی دا و وەك چوارەم خەلیفە هەڵبژێردرا.

ڕۆژانێکی سەخت چاوەڕێی حەزرەتی عەلی دەکرد. کۆمەڵێك کێشە هەبوون کە دەبوو چارەسەری بکردنایە. لەپێش هەموویەوە دەبوایە بکوژانی حەزرەتی عوسمان بدۆزرێتەوە و سزا بدرێن.

لەدوای نوێژی هەینییەوە خەڵکەکە ئاماژەیان بەوە کرد و بەمشێوەیە دوان:

-ئەی پێشەوای باوەڕداران! ئەو تاقمەی کە دەزانین حەزرەتی عوسمانیان شەهید کردووە و ئەو کارەیان بە حەڵاڵ داناوە بۆ خۆیان، پێویستە بدۆزرێنەوە و سزا بدرێن.

حەزرەتی عەلی:

- وە نەبێت ئەوەی ئێوە دەیزانن من نەیزانم. بەڵام لەم کاتەدا

چۆن دەتوانین سزای ئەو کەسانە بدەین کە خۆیان بوون بە دادوەر و خۆیان بەڕاست دەزانن. با لەپێشدا کەش و هەواکە جێگیر ببێتەوە دواتر مافەکان وەردەگیرێنەوە، بکوژەکانی حەزرەتی عوسمانیش دەدۆزرێنەوە.

حەزرەتی عەلی سەرەتا لە والیەکانەوە دەستی پێکرد. مەبەستی ئەوە بوو ئەو والیانە بگۆڕێت کە لە قەیرانەکە تێوەگلابوون و لەجێیان کەسانی دی دابنێت. هەربۆیە دەستی کرد بە ناردنی والی بۆ میسر و یەمەن و بەسرە و کوفە.

ئەو والیە نوێیەی کە ناردبووی بۆشام بەهۆی ناڕەزایی والیە کۆنەکەوە کە موعاوییە بوو نەیتوانی دەستبەکار بێت. حەزرەتی عەلی نامەی نارد بۆ موعاویە، بانگی کرد تاوەکو بە شێوەیەکی ئاشتییانە چارەسەری بکەن. بەڵام موعاویە نێردراوەکەی بێهودە ناردەوە. دواتر لە نامەیەکدا وەڵامی نامەکەی حەزرەتی عەلی نووسی و بە یەکێك لە نێردراوەکانی خۆیدا ناردی.

حەزرەتی عەلی کە نامەکەی وەرگرت زۆر دڵگران بوو. چونکە نامەکە ئەوەی دەردەخست کە موعاوییە بە جێنشینیی حەزرەتی عەلی ڕازی نییە.

* * *

# تاقیکردنەوە

کە موعاویە نارەزایی دەربڕی بەرامبەر جێنشینیی حەزرەتی عەلی، ناکۆکی کەوتە گۆڕێ. لەو ماوەیەشدا دایکی ئیمانداران حەزرەتی عائیشە بە مەبەستی عومرە کردن ڕۆشتبوو بۆ مەککە و زانیبووی کە حەزرەتی عوسمان شەهید کراوە. هەر کە هەواڵەکەی بیست خەڵکی لە چواردەوری حەزرەتی عائیشە کۆبوونەوە. قەرەباڵغییەکی زۆر دروست بوو. قەرەباڵغییەکە لەگەڵ حەزرەتی عائیشەدا بەڕێکەوتن بۆ بەسرە. لەناو قەرەباڵغییەکەدا دوو کەس لە عەشەرەی موبەشەرەشی تێدا بوو (ئەو دە کەسەی کە موژدەی چوونە بەهەشتیان پێ درابوو) ئەوانیش تەڵحەی کوڕی عوبەیدوڵڵا و زوبەیری کوڕی عەوام بوون. ئەو دوو هاوەڵەش کوژرانی حەزرەتی

عوسمانیان پێ قبوڵ نەکرابوو بۆیە لەگەڵ دایکی ئیماندارانلدا بەشدارییان کرد و بەڕێکەوتبوون بەرەو بەسرە. ئەوەبوو والی مەککە و یەمەنیش پشتگیری خۆیان ڕاگەیاند و بوونە کۆمەڵێکی گەورە. مەبەستیان زۆر ڕاستگۆیانە بوو. دەیانویست بکوژەکانی حەزرەتی عوسمان بدۆزنەوە و سزایان بدەن.

حەزرەتی عەلی کە لەم هەواڵە ئاگادار کرایەوە بە خۆی و سوپاکەیەوە بەرەو بەسرە کەوتەڕێ. هەردوو لا مەبەستیان نەبوو لەگەڵ یەکتری بجەنگن. حەزرەتی عەلی کە لە بەسرە نزیك بووەوە عامیری وەك هەواڵدەری خۆی نارد. ئەویش لە جێگایەك کە تەڵحە و زوبەیریشی لێ بوو لە حەزرەتی عائیشەی پرسی کە چۆن بەوەها کارێك هەستاوە. حەزرەتی عائیشەش وتی:

- ئەوەی منی ڕاپێچ کردووە بۆ ئێرە داواکردنی ئاشتییە بۆ خەڵکی.

-ئەی دایکی باوەڕداران مەبەستت چییە لە ئاشتی؟

- بەسزا گەیاندنی بکوژانی حەزرەتی عوسمان. تاوانباران بە سزای خۆیان ئەگەن و ئاشتی لەناو خەڵکیدا بەرقەرار دەبێت.

- ئەی دایکی باوەڕداران کێشەکە لەوە ئاڵۆزترە کە تۆ دەیبینیت. ئێستا تۆ لێرە دەبیت بەهۆی کوژرانی شەش سەد کەس. بەم هۆیەشەوە شەش هەزار کەس دەڕژێنە کۆڵانەکانەوە. لە کاتێکدا ئێوە بکوژی حەزرەتی عوسمانتان دەوێت. بەڵام شەش هەزار کەس هەمووی دێتە دەنگ و بەمجۆرە بکوژەکە دەشاردرێتەوە. ئەگەر ئێوە لەم کێشەیەدا لە شوێنی حەزرەتی عەلیدا بوونایە چیتان دەکرد؟ ئەویش وەك ئێوە

بیر دەکاتەوە. بەڵام دەیەوێت ماوەیەکی بەسەردا بڕوات دۆخەکە ئارام بێتەوە. وەرن ئێوەش پەیمان بدەن بە حەزرەتی عەلی. دەترسم لەوەی کە خوای گەورە بەڵایەکمان بۆ بنێرێت.

حەزرەتی عائشە:

- کەواتە عەلیش ئەوە دەڵێت کە تۆ دەیڵێیت. بە پشتیوانی خوا کێشەکە بەر لەوەی گەورەتر بێت چارەسەر دەکرێت.

قسەکانی عامیر کاریگەر بوو. کێشەکە لەوەدا بوو کە بڕەوێتەوە. عامیر بەم هەواڵە دڵخۆشکەرە ڕۆشتەوە بۆلای حەزرەتی عەلی و هەمووی بۆ باسکرد. بەڵام ئەم پێشهاتە عەبدوڵلای کوڕی سەبەئی سەرکردەی بکوژەکانی حەزرەتی عوسمان و شوێنکەوتووانی نیگەران کرد. بۆیە دەستبەجێ کەوتە پلان گێڕان دژی ئەو هەنگاوە ئاشتیخوازانەیە.

بەداخەوە کە واشیان کرد. چەند پیاوێکی چەکداریان ناردە نێو هەردوولاوە. حەزرەتی عەلی بێئاگایانە لە فیتنەکەی عەبدوڵلای کوڕی سەبەء، ڕۆیشتە بەسرەوە و ئەو شەوە بەخۆی و سوپاکەیەوە لەوێ نیشتەجێ بوون.

حەزرەتی عائیشە و ئەوانەی لەگەڵیدا بوون ڕۆیشتنە شوێنێك کە ناوی حەوئەب بوو و لەوێ نیشتەجێ بوون. ئەوەی جێی سەرنجە ئەوەیە کە لەو شوێنە دەنگی وەڕینی سەگ دەهات...

حەزرەتی عائیشە وەستا و پرسی ئەم شوێنە کوێیە. ئەوانەی کە لە دەوروبەریدا بوون وەڵامیان دایەوە و وتیان:

- ئێرە حەوئەبە، ئەی دایلی ئیمانداران.

- ئا حەوئەب! دەی سوێند بەخوا ئەو کەسە منم.

ئەوانەی لە دەوروبەری بوون لە وتەکانی دایکی ئیمانداران سەریان سوورما.

- ئەوە چی دەڵێیت ئەی دایکی ئیمانداران؟

- من لە پێغەمبەری خواوە بیستوومە. کە دەیوت بە ئێمە (مەبەست خێزانەکانی پێغەمبەرە) "حاڵی یەکێك لە ئێوە چۆن دەبێت، ئەگەر گوێی لە دەنگی سەگەکانی حەوئەب بێت کاتێك دەوەڕن؟" بۆیە وتی:

- ئەی زوبەیر خۆتان کۆ بکەنەوە با بگەڕێینەوە.

بارودۆخەکە ڕوون بووەوە. بەڵام قەدەری خوای گەورە بەو جۆرە نەبوو. لەناکاو دەنگێکی بەرز بیسترا. کەسێك ئەسپەکەی تاو دەدا و بە هەموو توانایەکییەوە هاواری دەکرد و دەیووت:

-دەی بۆچی وەستاون؟ عەلی و سوپاکەی بەرەوڕووی ئێوە دێن بۆ جەنگ.

ئەوەی کە هاواری دەکرد جگە لە پیاوەکەی عەبدوڵای کوڕی سەبەء کەسی تر نەبوو. لەو تاریکە شەوەدا نەدەناسرایەوە کە کێیە. ئیتر ئەوەبوو سوپاکە کەوتە جووڵە و وەستاندنی مەحاڵ بوو. بەهەمان شێوە بەرەی ئەولاش ئاگادار کرابوونەوە. سوپاکەی ئەوبەریش کەوتە جووڵە. ئەو جەنگەی کە نەدەتوانرا خۆیانی لێ ڕزگار بکەن دەستی پێکرد.

لە کاتێکدا کە جەنگ بەردەوام بوو، حەزرەتی عەلی لە زوبەیری کوڕی عەوام نزیك بووەوە و وتی:

- لەبیرتە ئەی زوبەیر ڕۆژێك دەڕۆیشتینە خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خوای لێبێت) زەردەخەنەیەکت بەرامبەرم کرد. پێغەمبەری خۆشەویستمان لێی پرسیت "ئەوت خۆش دەوێت؟" تۆش وتت بەڵێ پێغەمبەری خودا. پێی فەرمووی بەڵام تۆ لە ڕۆژێکدا لە دژی دەجەنگی.

- بەڵێ ئەی عەلی بیرم کەوتەوە. بەدڵگرانییەوە تۆ شتێکت وەبیرهێنامەوە کە لە بیرم چووبووەوە.

دواتر شمشێرەکەی فڕێدا و مەیدانی جەنگەکەی بەجێهێشت. بەڵام لەکاتی گەڕانەوەیدا لەلایەن دەستەیەکەوە کە خۆیان مەڵاس دابوو لە شوێنێکدا شەهید کرا. تەڵحەی کوڕی عوبەیدوڵاش زۆری پێ نەچوو بە تیرێك پێکرا.

لە دەمی تەواوبوونی جەنگەکەدا لە هەردوولا نزیکەی دە هەزار کەس بوونە قوربانی. حەزرەتی عەلی نوێژی لەسەر مردووەکان کرد. هەموو هەوڵێکی خۆی خستەگەڕ تاوەکو هیچ زیانێك بە دایکی موسوڵمانان حەزرەتی عائیشە نەگات. دواتر لەو خانووەی بەسرە کە بە میوانی دەمایەوە سەردانی کرد و کۆمەڵێك لە سەربازەکانی خۆی خستە ژێر فەرمانی ئەوەوە.

دایکی ئیماندارانیش حەزرەتی عائشە زۆر پەشیمان بووەوە لەوەی کە بەشداری جەنگێکی کردبوو کە بە هەزاران کەسی تێدا مردبوو.

- دەیوت بریا بەر لە ڕۆژی جەمەلماڵئاواییم لەدنیا بکردایە.

کاتێ پرسیاری جەنگی جەمەل کرا لە حەزرەتی عەلی بەم جۆرە وەڵامی دایەوە:

- ئەوان برامانن، ڕوویەڕوومان وەستابوون بۆیە ئێمەش لەگەڵیان جەنگاین. بەڵام ئێستا لە هەڵەکانیان پاشگەزبوونەتەوە، ئێمەش داواکەیانمان پەسەند کرد.

* * *

# داد پەروەری

حەزرەتی عەلی ڕۆیشتە بازاڕێکەوە. مەبەستی ئەوە بوو کە بزانێت کڕیار و فرۆشیارەکان چۆن هەڵسوکەوت لەگەڵ یەکتری دەکەن.

لە فرۆشیارێك نزیك بووەوە و لێی پرسی:

- حاڵت چۆنە؟ هیچ کێشەیەکت هەیە؟

پیاوەکە وتی:

- نەخێر هیچ کێشەیەکم نییە.

بازاڕەکە تا بڵێی قەرەباڵغ بوو. فرۆشیارێك هەوڵی دەدا ئەو زرێیەی کە بە دەستییەوە بوو بیفرۆشێت بەڵام کەس گرنگی پێ نەدەدا. حەزرەتی عەلی زۆر بە سەرنجەوە تەماشای ئەو زرێیەی کرد. لەبەر ئەوەی زۆر لە زرێیەکەی خۆی دەچوو. دواتر ڕۆشتە بەردەم کابراکە و وتی:



- دەتوانم تەماشای بکەم؟

فرۆشیارەکە وتی

- فەرموو تەماشای بکە.

کاتێك حەزرەتی عەلی زرێکەی گرت بە دەستییەوە و لێی ورد دەبووەوە، پیاوەکە هاواری دەکرد و دەیوت:

- زرێمان لایە بۆ فرۆشتن.

حەزرەتی عەلی لە پاش لێ وردبوونەوەیەکی زۆر بۆی دەرکەوت

که ئەو زرێیە هی خۆیەتی.

- وتی ئەم زرێیە هی منە تۆ مافی ئەوەت نییە بیفرۆشی.

پیاوەکە لەگەڵ ئەوەی کە حەزرەتی عەلی دەناسی بەڵام خۆی وا پیشان دەدا کە نایناسێت و وتی:

- نەخێر ئەمە زرێی منە و ئەمەوێت بیفرۆشم.

حەزرەتی عەلی باش دەیناسییەوە کە ئەوە زرێیەکەی خۆیەتی بۆیە وتی:

- ئەم زرێیە هی منە، ونم کردبوو.

کاتێك دەنگە دەنگەکەیان گەورە بوو ئەوانەی لەوێ بوون لە چواردەوری حەزرەتی عەلی و فرۆشیارەکە کۆبوونەوە. هەمووی هەوڵی ئەوەی دەدا کە تێ بگات بزانێ چی بووە. حەزرەتی عەلی زرێیەکەی هەڵگرت و جارێکی تر لێی وورد بوویەوە. کە دڵنیا بوویەوە لەوەی کە زرێکە هی خۆیەتی، وتی:

- شوێنەواری شمشێرەکان دەناسمەوە ئەمە هی منە.

- ئەوە لەسەر هەموو زرێیەك هەیە، دەبێت بیسەلمێنیت کە ئەمە هی خۆتە.

- حەزرەتی عەلی وتی مادەم وایە با بڕۆینە بەردەم دادگا و دادگا بڕیاری لەسەر بدات.

فرۆشیارەکە سەرەتا ڕازی نەبوو. بەڵام کە بینی ئەوانەی چواردەوری بەگومانەوە تەماشای دەکەن، هیچی بۆ نەمایەوە و وتی:

- باشه با بڕۆین.

هەردووکیان بەیەکەوە ڕۆشتن بۆ دادگا. فرۆشیارەکە بە دادوەرەکەی وت:

- من لەسەر ئایینی ئێوە نیم، کەسێکی گاورم. لەبەر ئەوە دەترسم بە دادپەروەرانە هەڵسوکەوت نەکەیت.

دادوەرەکە:

-ئەوە گرنگ نییە بەلای منەوە کە لەسەر چ ئایینێکی. کێ لەسەر حەق بێت لە بەرژەوەندی ئەو بڕیار دەدەم.

فرۆشیارەکە لەگەڵ ئەوەی ئەمانەشی بیست هەر دوودڵ بوو، هەرچۆنێك بێت کەسەکەی بەرامبەری جێنشینی موسوڵمانان بوو. دادوەرەکە یەکەمجار مۆڵەتی بە حەزرەتی عەلی دا کە قسە بکات. حەزرەتی عەلی ئەوەی دووپات دەکردەوە کە ئەو زرێیە هی خۆیەتی.

- ئەو زرێیە هی منە چەند ڕۆژێك لەمەوبەر ونم کردبوو.

دادوەرەکە لێی پرسی

- ئایا دوو شایەتت هەیە کە شایەتی بدەن ئەو زرێیە هی تۆیە؟

- بەڵێ. ئەگەر دەتانەوێت دەڕۆم بانگیان دەکەم.

لەپاش ئەوەی دادوەرەکە مۆڵەتی پێدا، حەزرەتی عەلی بەخێرایی ڕۆیشت حەسەنی کوڕی و خزمەتکارەکەی هێنا بۆ بەردەم دادگا.

دادوەر:

- ئەی عەلی خزمەتکارەکەت دەتوانێت شایەتیت بۆ بدات بەڵام

کوڕەکەت ناتوانێت. دەبێت یەکێکی تر بدۆزیتەوە بۆ شایەتی.

- چۆن دەبێت؟ هەموو کەس دەزانێت کە حەسەن کەسێکی ڕاستگۆیە.

- منیش دەزانم ئەی عەلی، بەڵام بە پێی یاساکانی ئیسلام شایەتی باوك بۆ کوڕەکەی و کوڕیش بۆ باوکی وەرناگیرێت.

فرۆشیارەکە بە سەرسوڕمانەوە تەماشای دەکردن. وا بیری دەکردەوە کە دادوەرەکە لێپرسینەوەی زۆر لە حەزرەتی عەلی ناکات کە لە خۆی گەورەتر بوو وە خەلیفەی موسوڵمانان بوو. بەڵام پێشهاتەکان بەو شێوەیە نەبوو کە ئەم بیری لێ دەکردەوە. دادوەر لەوەدابوو کە حەزرەتی عەلی بنێرێت بۆ لێپێچینەوە و شایەتییەکەی قبوڵ نەکات. بەڵام فرۆشیارەکە بە دادوەرەکەی وت:

- بوەستن.

هەموو خەڵکەکە ڕوویان کردە فرۆشیارەکە.

- زرێکە هی حەزرەتی عەلییە. ڕۆژێکیان کە پێشەوای موسوڵمانان بەسەر حوشترەکەیەوە بوو. منیش لە دوای ئەوەوە دەڕۆیشتم. زرێکە لەسەر پشتی حوشترەکەی کەوتە خوارەوە. بەڵام پێشەوای موسوڵمانان هەستی بەمە نەکرد. منیش بێ ئەوەی کەس بیبینێت زرێکەم هەڵگرتەوە. بەڵام زۆر پەشیمانم لەوەی کە کردوومە.

هەموو کەس ئارامی دایگرت کاتێك کە بەمجۆرە چارەسەر کرا. بەڵام فرۆشیارەکە بە تەما نەبوو بێدەنگ بێت. بۆیە مۆڵەتی وەرگرت و بەردەوام بوو لە قسەکردن.

- بینیم کە ئایینی ئیسلام ئایینێکی زۆر جوانە. موسوڵمانان کەسانێکی زۆر دادپەروەرن! جێنشینێکی گەورە و گران ناتوانێت کەرەستەکەی خۆی لە پیاوێکی گاور وەربگرێتەوە. دادوەر شایەتی ئەو کەسە قبوڵ ناکات کە سەرۆکی دەوڵەت هێناویەتی. منیش ئەم ئایینە جوانە قبوڵ دەکەم و موسوڵمان دەبم.

ئەوەبوو شایەتمانی هێناو موسوڵمان بوو.

حەزرەتی عەلی کە ئەمەی بینی زۆر دڵی خۆش بوو، ڕۆشتە لای فرۆشیارەکە و پیرۆزبایی لێ کرد. زرێکەی کە لەسەر زەوییەکە بوو هەڵی گرتەوە و وتی:

- بیگرە براکەم ئەم زرێیە بۆ تۆ، هەروەها ئەسپێکیشت وەك دیاری پێ دەبەخشم.

* * *

# دەمی ماڵئاوایی

بەهۆی ڕووداوی جەمەل و دادوەرییەکەوە، حەزرەتی عەلی زۆر دڵگران بوو، لەناخەوە بریندار بوو. لەم هەموو ئازار و ناڕەحەتی و تەنگ و چەڵەمەدا تەنها یەکێك بەرگەی دەگرت کە لەژێر دەستی پێغەمبەردا گەورە بووبێت.

ئەو کاتێك هەوڵی دەدا بە باشترین شێوە ئەرکەکەی سەرشانی خۆی جێبەجێ بکات، بێ هەواڵ بوو لەوەی کە پلانێکی ترسناکیان بۆ داڕشتووە.

یەکێك لە هەڵگەڕاوەکان کە عەبدوڵڵای کوڕی مەلجەم بوو لەگەڵ دوو هاوڕێی ڕێك کەوتبوون لەسەر ئەوەی کە ڕزگاربوونیان تەنها بە کوشتنی سەرکردەکانیان دەبێت.

ئەوەی کە لەدوای ئەوەوە ڕووی دەدا هیچ بەلای ئەمانەوە گرنگ نەبوو.



-ئەگەر ئێمە گیانی خۆمان ببەخشین لەپێناو ڕێگەی ڕاستدا و ئەو سەرکردانەی کە لەسەر ڕێگەی ڕاست لایانداوە بیانکوژین، خەڵکی لەوانە ڕزگاریان دەبێت و ئێمەش ئەوکاتە تۆڵەی براکانی خۆمان کردۆتەوە.

ئەوانەی تر بەرێ کەوتن بۆ کوشتنی موعاوییە و عەمری کوڕی عاس. کوڕی مەلجەمیش بۆ شەهیدکردنی حەزرەتی عەلی بەرەو کوفە بەڕێکەوت. چەندین ڕۆژ ئامادەکاری کرد و پیلانی داڕشت.

بەیانییەکی ڕۆژی هەینی بوو. حەزرەتی عەلی ئەندامانی خێزانەکەی بەئاگاهێنایەوە بۆ نوێژی بەیانی و خۆی بەرەو مزگەوت کەوتەڕێ. ئەو کەسەی کە لەسەرخۆ بە دوایەوە بوو لە تاریکییەکەدا وای دەزانی ئەویش وەك خۆی بۆ مزگەوت دەڕوات بۆ نوێژی بەیانی. بەڵام کوڕی مەلجەم لەناکاو بە شمشێرە ژەهراوییەکەیەوە هێرشی کردە سەر حەزرەتی عەلی و چەند جارێك شمشێرەکەی کرد بە جەستەیدا.

ئەو موسوڵمانانەی کە دەڕۆشتن بۆ نوێژ هەستیان پێ کرد و خێرا بکوژەکەیان گرت. ئەوانەی کە دەهاتن بۆلای حەزرەتی عەلی، حەزرەتی عەلی پێی دەوتن:

- واز لە من بهێنن. ئێوە بڕۆن نوێژەکەتان بکەن، با نوێژەکەتان لەکیس نەچێت.

لە ناو ئازاردا دەتلایەوە و تەماشای برینەکانی دەکرد کە خوێنیان لێ دەڕۆیشت. لەلایەکی تریشەوە تەماشای کوڕی مەلجەمی کرد و پێی وت :

- بیخەنە بەندیخانەوە و لەوێ باش هەڵسوکەوتی لەگەڵدا بکەن. ئەگەر لەژیاندا مام بیرێك دەکەمەوە لەوەی کە چی لێ بکەم؛ لێی دەبوورم و یاسای خوای گەورە جێبەجێ دەکەم. ئەگەر مردیشم، با لەبری گیانێك گیانێك وەربگیردرێتەوە.

حەزرەتی عەلیان هێنایەوە ماڵەوە. لەوە زیاتر بەرگەی ئازاری برینەکەی نەدەگرت.

- لەپاش خوێندنی ئەو ئایەتەی کە دەڵێ "هەرکەسێك هێندەی

تۆزقاڵێك چاكە بكات پاداشتەكەی وەردەگرێتەوە و هەركەسێكیش هێندەی تۆزقاڵێك خراپە بكات سزاكەی وەردەگرێتەوە.“ و لە تەمەنی شەست و سێ ساڵیدا چاوەكانی لێك ناو وەفاتی كرد.

پێش ئەوەی چاوەكانی لە دنیادا لێك بنێ، بە حەسەنی كوڕی ووت:

- كوڕم جوان گوێ بگرە بۆ ئەم ئامۆژگارییانەم:

گەورەترین سەروەت ئەقڵە، گەورەترین دەستكورتیش گێلییە. گەورەترین تەنهایی لەخۆ ڕازیبوونە. باشترین شتیش ڕەوشتی جوانە. خۆت بە دوور بگرە لە هاوەڵیی كەسانی گێل. چونكە لە كاتێكدا بیەوێت قازانجت پێ بگەیەنێت، زیانت پێ دەگەیەنێت. لەگەڵ كەسی ڕەزیلیشدا دۆستایەتی دروست مەكە. چونكە بەدوورت دەگرێت لەوشتەی كە پێویستت پێیەتی. یەكێك لە باشترین كلیلەكانی سەركەوتنیش، هاوەڵی كردنی كەسی ڕەوشت بەرزە..

* * *

# حەزرەتی
# عەلی

## ڕەزای خوای لێبێت

کاتێك پێغەمبەری خوا لەبارەی ڕای باوکییەوە پرسیاری لە حەزرەتی عەلی کرد، حەزرەتی عەلی بە چەند وشەیەك وەڵامی دایەوە کە زۆر لە تەمەنی خۆی گەورەتربوون:

- ئایا خوای گەورە کاتێك منی دروستکردووە، پرسی بە باوکم کردووە؛ تا ئێستا بۆ باوەڕهێنان بەو، من بچم پرس بە باوکم بکەم؟!

ئەوساڵەی پێغەمبەر (د.خ) بڕیاری حەج کردنی دا. حەزرەتی عەلی لە یەمەن بوو. ئەو بەتایبەتی لەلایەن پێغەمبەری خوداوە نێردرابوو بۆ یەمەن بەمەبەستی بانگەوازکردن بۆ ئایینی ئیسلام. حەزرەتی عەلییش ماڵ بە ماڵ دەگەڕاو بانگهێشتی دەکردن بۆ سەر ئایینی ئیسلام.

هەر کە هەواڵەکەی بیست خێرا بەرەو مەککە بەڕێ کەوت. کۆمەڵێك خەڵکی تازە موسوڵمانیشی لەگەڵدا بوو.


9 649750 000284
Gül Devri- 5 Hz. Ali

نرخی ٣٠٠٠ دینارە

İRFAN
PUBLISHING